یا هوو

# ساباتی شێعر

## بەرهەمی کۆڕی هاوبەشی شاعیرانی شارەکانی

بانە ؛ بۆکان ؛ سەقز ؛سەردەشت ودیواندەرە

جۆزەردانی ٢٧٠٧ی کوردی کوردستان– بانە



ئامادە کردن :

محەممەد سدیق کەریم پوور baneviyana@yahoo.com

سۆران حوسێنی Soran_ hesaw@yahoo.com

رووبەرگ :

بەختیار ئازادی bakhtyar.azadi@ yahoo.com

چاپ :

دانش

نووسینگەی ئەنجوومەنی ئەدەبی فەرهەنگی بانە – ٠٨٧٥٤٢٤٤٠٥٠

# پێشەنگانە

بۆ هەر پێڕ و تاقم و دەستە ،کە وەخرِ بوونیان مەبەستە و دەبنە هاوکووف و شان و دەم، لە خۆشی و خەم ؛دابەشی یەکتری دەکەن پەنا بە یەکتری دەبەن ؛ ژوانێك هەیە ؛ سابات و هەیوانێك هەیە ؛ کۆگە و مەکۆ و لانێك هەیە .لە وێندەرێ یەك دەبینن ، یەك دەدوێنن ؛ بۆ یەکتر گوێ ڕادەدێرن ؛ هەر بۆ یەکتریش دەخوێنن کولَی دلَیان هەلَ دەڕێژن ؛ بیری یەکتر دادەبێژن ؛ تیو تیوەی بیری یەك دەدەن یارمەتی ژیری یەك دەدەن ،پێکەوە دێنە پێناسە ، بۆ خولیا و ئارەزوو تاسە ، ئێمەش لە مەکۆی شازی ؛ پڕ لە شکۆ و لە شانازی، ئەدەبی فەرهەنگی خۆمان ،کە بۆتە ساباتێ بۆمان ، پۆلێ هەلَۆی تیژ فڕو ڕۆی ، بواری ئەدەب و فەرهەنگین ، دژی مێشکی تەسك و تەنگین . حەزمان بەفرین و بەفڕین پشوو درێژی ڕێ بڕین ، لووتمان بە لووتکەوە ناوە هەوای حەوا و بەرزەفڕی لە کەللە و سەرمانی داوە ؛ نەشەمان دێ بەگەشەی ژین ، بە چاو کراوەیی و زانین ، هەلَوەدای سینەی کراوەین ، بە تێگەیشتن براوەین . بەر هەستی کات و دۆخی نوێین ، لە داکۆکی بۆ مان ئەدوێین ، ٢
هەرمان حەزمانە و بەجێ یە ، هونەر لامان شەنگە ڕێیە ،هەموان دەکەینە ئامارژە وەك ئێمە بۆ پەلەقاژە ،بانگەشەو داد و گاز ئەکەین ، هەموان شەریکی ڕازئەکەین ، شێعر و ڕازە و چیرۆکنووسین ، بالاَی قەلَەم ڕادەمووسین ، گوێ ئەدەینە هەر دەنگ و باس ، بەلاَم نەك حۆل و ووڕ و کاس ؛ وریا و بە بیر و تاو و تۆی ؛ لە هەر کات و هەر شوێنی نوێ ، بۆ هەرکەس لە هەرچی بدوێ ، ڕێگامان بەرە و ڕوونی یە ؛ دوورکەوتنەوەی زەبوونیە ، ئاوقا بوونی چەتوونیە ، ئەم بەرهەمە نەسەرجەمە و نەکەمە و نەلانی کەمە ؛ پۆلێ دێڕی قنج و قیتن ڕوو لە چاوی بڕێ زیتن ، بەو هیوایەی جێی پەسەن بێ ؛ لاتان تۆزقالَێ ڕەسەن بێ .

بەرپرسی ئەنجومەنی ئەدەبی فەرهەنگی بانە



# کورتە باسێک سەبارەت

# سۆران حوسێنی

سۆران حوسێنی کوڕی مامۆستا شێخ عیزەدین حوسێنی لە هەشتی مانگی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٤٧ لە گوندی چیچۆران لە پێنج کیلۆمیتری شاری بانە لەدایک بووە ؛ خوێندنی بە هۆی هەل ومەرجێکی تایبەت تا دیپلۆمی ئەدەبیات و علوومی ئینسانی درێژە داوە ؛ لەساڵی ٦٨ بەدواوە بە شێوەیەکی جیدی هەڵوەدای شێعر بووە وساڵی ١٣٧٠ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی شێعر وئەدەبی بانە . پێش ساڵی حەفتا نامیلکەیێکی شێعری لە تیراژێکی کەم دا بڵاوبۆتەوە ودوای حەفتاش لە بڵاو کردنەوەی کۆمەڵە شێعری "تا ئاربەبای خۆشەویستی " لە گەڵ ئەندامانی ئەنجومەن هاوبەش بووە . یەکەم کتێبی سەربەخۆی سۆران بەشیوەی پەرمی کۆمەڵە شیعری " هەساو"ە کە لەساڵی ٨٤ دا کەوتە بەردەستی خوێنەران .شێعری ئەو لە چەندین گۆڤار و ڕۆژنامە و نامیلکە و تایبەتنامەدا چاپ و بڵاو بوونەتەوە لەوانە دوو کۆمەلە شێعری "گوڵچینی شیعری شاعیرانی کورد" بەشی یەکەم لە بڵاوکردنەوەی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ورمێ و کۆمەڵە شێعری گازە.سۆران حوسێنی کۆمەڵە چیرۆکی سێ دڵۆپ خوێنی سادق هیدایەت و شانۆنامەی ووت و وێژی محەمەد ڕەحمانیان وچەند شێعری فەرەیدوون موشیری کردۆتە کوردی. هەروەها چەندین ووتار و ڕەخنەی ئایینی و سیاسی و ئەدەبی بڵاو کردۆتەوە.دوو کۆمەڵە شێعری "بازنەی گڕ" و "پەڕەژاڵ" ی بۆ چاپ سپاردووە بە ئینتیشاراتی تاڤگەی سنە .موجری یەکەمین فستیڤاڵی چیرۆک و بەرێوەبەری شەشەمین فستیڤاڵی چرۆکنووسانی ڕۆژئاوای ئێران بووە .سۆران یەکێک لە چالاکانی ئەدەبی فەرهەنگی باژێری بانەیە و لە ساڵی حەفتاوە لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنی ئەدەبی فەرهەنگی باژێری بانەیە و نزیک بە دە ساڵ و ئێستاش بەرپرسی ئەنجومەنە .

خۆزگە   پانتاوی ئەویندارى بەرین
خۆزگە زەربەی   ترپە سەودادار تر
خۆزگەمێرگی شێعرەکانم سەوزەڵان
خۆزگە   هەودای چرپە مەودادار تر

## چاو بە چاو

٤

کە سەر دەنێم بە سەرتەوە
برۆکانت دوو ڕێگەن پێچەوانەی یەک
چاوەکانت
گەورەترن لە گۆی زەوی
کە سەر دەنێم بە سەرتەوە
بری مانگ و بری خۆر و
بری ئاسمانیش دەکەوی
تۆ لە ئاو ژیناوی تری
لە هەر کوێ بی ئاوەدانە
نازانم بۆ
ڕێت لە هەموو شوێنێک کەوت
قوژبنی ئەم ماڵەی ئێمە
هەر وێرانە !؟

## تەپکە



ناخت قاقڕ بوو
بکوژ بوو
چاوت نەی هێشت کەس بیبینێ
دڵت کاول بوو
خوێن مژ بوو
لێوت نەی هێشت خۆی بنوێنێ
لێوت پشکووت
وەکوو پەڵە سێوەڕەی پڕ
چاوت چاوگەی
بەر بناری گمۆ و گاکڕ
من چووزانم
دڵ کاولە و ناخت قاقڕ .

## تۆران

هێندەی دابڕان
سەرەتایە بۆ شیعرە
زبری وشەش بۆ دابڕان.!
تۆران ؛
بەرهەمی ناسکی و تەرچگی
دڵی تۆیە و
پێکەوە بوون؛
ئاکامی پێداگریم .
ژیان بەرهەمی شەڕی تۆیە
لە گەڵ تۆران
ژیان بەرهەمی ئاشتی منە
لە گەڵ هەرمان
ئەوەندی تۆ
هەوڵ ئەدەی بۆ گەشەی تۆران
من سوورترم
بۆ ڕزگاری ژین لە مردن
شێعر ڕۆژ ژمێری تۆران و
شێعر هەوێنی داکۆکی منە بۆ مان
بۆ دوور کەوتنەوە لە تۆران
ئەوەندەی تۆ
بەرهەستی وشە و شیعرمی
مردن بێ دەربەستی ئێمە و
ژین و
شیعرە
هێندەی تۆران لە تۆ جوانە
مردن دێز وناحەز و ڕەزاگرانە .

خۆش فڕ و ڕەوتــن کەوو کۆتر بەڵام
نافڕن یەک چەشن و یەک ڕادە و تەرز
یەک لە قەد پاڵــی دەقاسپێنێ و نەوی
یــەک لە ئاسمانــی دە ئاڵێنێ و بەرز

## کۆچ



هەر کە شیعر
نەیتوانی بە لانەی وشەی
پەڕەسێلکەی خۆشە ویستی
داڵدە بدات
کۆچ ئەقەومێ
هەر کە وشەم
نەیتوانی ئارامت وەکات
کۆچ ئەقەومێ
کۆچ بێزاری تۆ لە شیعرە
کۆچ دوور کەوتنەوەم لە مانە
کۆچ وەپشت گوێ هاویشتنی
هەر چییەکی بڕێک شەنگ و
بڕیک شیعر و
بڕیک جوانە .

## حەز

چنگ وەگرە بەرەو ئاسمان
بۆ کلوو کلووی بەفر و
دڵۆپە دڵۆپەی باران
چەندە لە نێو لەپت بەندە
هێندەیە خۆشەویستی تۆ
بۆ منی شێت
ڕادەی حەزی منیش بۆ تۆ
بە قەد ئەو کلووە بەفرانە و
ئەو دڵۆپە بارانانەی
کە وە چنگی تۆ ناکەوێت .

# درۆ

درۆ دەکەن
دەزانین و دەنگ ناکەین کە
درۆ دەکەن :
" لووتی بزووتی سەر وەجاخ سارد و سڕە
شەمچەی سەر تاق و ڕەفحەمان خوساو و خاو
بێ سۆلە لەنتەر و
چلۆسکی ئەم بەرهەیوانە
بێ بلێسە و تیشک و گڕە "
چی لێ بکەین
لە ئارەزووی محاڵ ؟
چی لی دەکەین
لە چاوە چاوی بەردەوام
لە گوێی بە زۆر کلۆری بێ بەر و بەتاڵ ؟
ئەی ئێوە چی ؟
چی لە بڵقی سەر ئاو ئەکەن
چی لە قوڵینەی دڕاو
چی لە تەقەڵی ڕزیوی
پینە و پەڕۆی کڵاو ئەکەن ؟؟
دڵمان بە خوێن
لەشمان بە زام
لە هەیوانمان چرا ئەدزن
لە بەر هەیوانمان تاریکی پیادە دەکەن
نە لە دڵمان

ئەتوانن ئەوین بسێنن
نە لە لەشمان
ئەتوانن هیوا دەربێنن
نە دڵ بە چلۆسک ئەدەین
نە بە لەنتەری خۆش ئەکەین
شەو بشکێنێ
شەو خۆی خەریکی کز بوونە و
خۆی لە دۆخی مردنایە
خۆ دەرەقەتی مانەوەی خۆی هەر نایە
لەیلا !
زانایی ژەکی تۆ ئەمژێ
دەسەڵات فرچک لە تۆ وەر ئەگرێ
لە بەر ئەم هەیوانە
بە هەنیسک و گریانەوە
بۆدەق گرتووی ؟
بەم حەسرەتە تاقانەوە بۆ دامردووی ؟
هاکا سبەی
یەکێک بە پشت ماڵاندا هات
قولە مشتی پڕی دەسماڵ
هاکا سبەی بە بن میچی
ئەم هەیوانەوە زرینگا
بۆ گۆوەندێ کۆنە شمشاڵ

# خۆزگە

دیمەنێکت خستۆتە ڕووی
حەسرەت و داخی شەیداییم
خۆمی لێ دوور خستووەمەوە
بۆتە جێگر
بۆتە تەنیا جێنشینی
سوڵتان نشینی تەنیاییم
چ مەشقێکت بەر مەبەستە
چ کەتنێکت لە بەر دەستە
ئەی تینووی بە چۆکا هێنان
چیت پێ شک دێ لە ڕیسواییم
خۆزگەگێژەڵووکەیێک
خۆزگە سێڵاو
خۆزگەباران
لە جەستەی مرۆڤی دەسڕی
هەوەس و زڕە سەودایی
خۆزگە کانی
خۆزگە هەتاو
خۆزگە چڕۆ و سەوزەڵانی
بە باڵای مرۆڤی دەبڕی
خۆشەویستی و
ئەوینێکی تاهەتایی .

## مەسێجە کان

١

موبایلم پەشمی شیشەیە
ئۆقرە و ئارامی
هەڵ گرتووم
کە مەسێجی تۆشی هێنا
کەف و کوڵێکی دامردووم

٢

بێ فلاش وێنەم کێشاوی
نووری
لە پاساژی نوورا
هەتاوت بۆ دێتە سەر چۆک
لە دەرێ بی یا لەژوورا .

٣

چرکەیەکم خۆ بۆ دەرخە
بە قەد قرتەی
فلاشی موبایلەکەم
با گەلەری لە ڕوخساری
شەنگ و
شاز و
نازت پڕکەم

٤

شێعر سواری شەپۆل ئەبێ
شێت و
شوور و
سەر هەڵگرتوو
ئەگاتە تۆ
موبایلە نازەنینەکەت
لە گەڵ خۆیا ڕائەژێنێ
یا شێعرەکەم دەخنکێنێ
یا موبایلت پێ دەردێنێ !

٥

خووت بە ئێس ئێم ئێس (sms) گرتووە؟
یا مەسێجە شێتەکانم ؟
کە دەتهەوێ بمناسیەوە
مەقامی تەیرەکەی گەرمێن
دابنێ بە ناو نیشانم .

٦

یەک جار وەڵام نادەیتەوە
تاکوو لە کۆڵ خۆتم وەکەیت
چەند چار
ئەم دێرەت وەخوێنم
ئای سی یوو لەیت ...
I SEE YOU LATE□

٧

ئاپ دەیتی
هەفتە و مانگ و ساڵ
مۆد نەماوە نەیخەیتە چاڵ
بۆ ئاڵبۆمیش بێ دەتهەوێ
ئەوینی کۆنە عەنتیکەم
با لە گەڵت بێتەوە ماڵ !

٨

تا پەیامێکت پێم ئەگا
سەد مەسێجم
ئەتهەژێنێ
تا دانەیەکیان بەجێ یە
دەیان
بێ وەخت و بێ وادە
لە نێو پۆلێک دەت تەزێنێ
ڕووم نەدەیتێ
ڕێگری دەستە و ئێخەتم
ڕووم پێ ئەدەی
مەسێجی خەت و بێ خەتم !

٩

زەنگ بۆ موبایلەکەت دەدەم
بۆ خۆم
لەرز دام ئەگرێت و
بۆ خۆم
هەناسە سوار ئەبم
کە خەت نادا
دیسان هەر خۆم

تاسەبار و
نەخۆش و لەش بەبار ئەبم
وا موبایلت
لە تەک خۆتا گوازتۆتەوە
بۆ نێو دڵم !
کە خەت نەدا
بۆ لە کوڵم ؟

١٠

کە نەدیاری
جەنگەی شێعر وشاعیریمە
شێعر ئەبیسم
شێعر ئەدوێنم
شێعر ئەنووسم
شێعر ئەخوێنم
کە دیار ئەبی
دێرێک شک نابەم لە شێعر
پێشواز و پایەندازت بێ
یان دەمێ تۆی پێ بدوێنم
شێعر و تۆ سێبەر و خۆرن
لە تەک منا نیوە ئاشت و
لە گەڵ خۆتان نیوە تۆرن !
ئەم موبایلەم
بۆیە ئاوەها خۆش ئەوێ
لە نەرمەڵانی مەسێجیا
سێبەر و خۆر بە دەستەملان
دەست ئەکەوێ .

١١

وەخت و بێ وەخت

جووکەی sms یَکم دیَت

پاساوی دەی ؟

نازانی چۆن !

نایخوێنیەوە ؟!

دوو سێ جووت چاوی بەپرسیار

ڕووبەڕووی تۆن

ناکرێ بیدڕی

ناکرێ وەیسڕی

هەر پێت ئەکرێ

خۆ لە ئاستیان گێل و کەڕ کەی

چی لەیاری

نالەباری

وا بەدفەڕ کەی

چی لە شەڕ کەی ؟!

١٢

کە لەلاتم

ڕووبەڕووت دام ئەنیشێنی

میوانێکی

ماقووڵ و

هێژا و

سەربەرزم

کە دوورم

لە نێو جانتاکەت

ویبرەم و

هەر هەڵ ئەلەرزم

نە هەڵ لەرزین
نە هێژایی
نە تاسەم هەڵ ئەچۆڕێنن
نە پێم ئەبەخشن سوکنایی .

١٣

ناهێڵێ
نووزەڵەی نووکەم
لە موبایلت بێتە دەرێ
ویبرەت کردە ناونیشانم
سووچێکی تەنیاییەکانت
پێ حەیفە بۆ نامەکانم
ئەی خۆت بۆ لفە دوانەمی
هەمووکاتێ
لە گش شوێنێ
وەکوو داڵغەم
وەکوو تاسەم
وەکوو تاقانە هۆی مانم
وەکوو گیانم .

١٤

کە شار ئەکەی بە وێرانە
مەسێج دەلاقەی هیوامە
کە خەت نادا
قوژبنی شێعرێ پەنامە
کۆچی تۆ و
بێ خەتی ئاخر
دەیانەوێ ببمە شاعیر .

١٥

به بیانوو و بەهانەی لێمان
مە سێجەکانت وا دیارن
نازت وەک جاران ئەکێشم
کەی توانجەکانت نازدارن
ئاماژەکانت زۆر کورتن
وشەکانت زۆر بێ گیانن
زمانی نامەت گۆڕیوە
نامەکانت نیشانەی لێک دابڕانن !؟

١٦

بەینێکە دەنگت لێ نایە و
بەینت لە گەڵ
نامەی ئەلەکترۆنیش تێک داوە
دەکرێ
گۆشە نیگام پێ بەی
تا بزانم
چی قەوماوە !
نە تەک زەنگ و
نە نامە و
نە مەسێج هیچ کام
تیا نییە
وەکوو نیگات تام .!!

١٧

مەسێجەکانم ئەبژێری
دە بە یەک
جواب ئەدەیتەوە
وایش هێشتە پێم ناگەیتەوە

ناوەرۆکی مەسێجی من
سۆزن ؛ شێعرن
پڕ بە پڕی حەزی ژوانن
هی تۆش لێواو لێوی تانە و
هێشتەش لە بەر دڵم جوانن
هیچ ئەزانی
نە دەتوانی
لە بیر خۆتم ببەیتەوە
نە دەتوانی
لە کۆڵ خۆتم بکەیتەوە .

١٨

هێندەم مەسێج بۆ هەناردووی
بە ئەویندارییم ئەزانن
دەورو بەرم
هێندەت نەرمە ناز بۆ کردووم
واز ناهێنێ
دڵەی سەرکێش و لەسەرم
من و نووکە
من و نامە
من و مەسێج گۆڕینەوە
من و هیوا و حەز و تاسە
پێکەوە دەکرێین پێناسە .!

١٩

دەلاقەی هەست
فەلاقەی خەم
دەرووی فریا
ڕێژنەی دەرفەت

جیژنەی جیژوان
ڕۆژنەی هیوا

هەساوی بوون
هەتاوی ژین
هەوێنی مان
ترپەی تەرچگ
چرپەی فێنک
گرپەی هەژان

نوخشانەی ڕۆژ
نوقڵانەی شەو
مژدەی دامە
بژوێنی گوڵ
بزوێنی دڵ
کورتە نامە

# چوار ناچار

یەکەم جار
شیوی دێت تەژی کرد
لەنەخشی وەنەوشە و
لە تامی ترووسکە و
نوخشانەی
ترشۆکەی زووی بەهار
دووهەم جار
ئەوین بووی
هەنگوینی هاوین بووی
دووکانت کرد بە باخ
پڕ لە سێو
پڕ هەنار
لە خۆشی و هەژین تێر
بە قەد شار
سێهەم جار تەزیوی پاییزبووی
خزیوی سووچی ماڵ
حەزت هەر بەتاو بوو
بەڵام نە لێوت دەپشکووت
نە چاوت پێی مابوو
دیمەنێک لە ساماڵ
چی تۆی کرد بە چرۆ
چۆن بوویتە تاقانەی

سەرەتای سەرماوەز
دەمزانی نات بینم ئیتر قەت
نابیتە گوڵی ڕووی بەفرانبار
زوو زانیم
بەختی وا ناوەختە
نابێتە تابلۆییێک بۆ ژمار
زوو زانیم
ئەم شەنگە دیدارەت
ئەبێتە کۆتایی
ئەبێتە دوایین جار .



## دووری

بۆچی مردووم ؟!
خۆشەویستیت ڕێگایەکی دووری دوورە
نیشتمانێکی بەرین و
بێ سنوورە
بۆچی مردووم ؟
بۆ ئەو ئەشقەی
دەمکێشێ و داگیری کردووم
وەکوو زەوی
وەکوو ئاسمان
وەک هەست و بوون
وەک ژان و ئاڵۆشی زامی
لە سارێژ بوون و گۆشتە و زوون.!!

## سەرپشک

سەری سەودا سەر و
گەرمی حیسابم
نە دەمهێڵێ
کە ڕامێنم لە جوانی
نە دەشگونجێ
لە گەڵ عەشقا تەبابم
سەری سەودا و
دڵی شەیدام هەبێ من
بەناچاری
دەبێ یەکیان پەسەند کەم
لەوی دیکەش
دەبێ حەتمەن جودابم !



## گوڵی ناْن

کوڵمەت گوڵی نانە و
چاوت
تەنوورێک لە ئاگر
کە تاسەم دەڕژێتە چاوت
نەوتە و بەنزین
کوڵمەت دەبرژێ و سوورئەبێ
لە بەر تەنووری ئاگرین .

## حەسرەت



دوای سێ وادە
ڕێگاییێکی دوور ئەپێوی
بە هەڵە داوان تا ژوانگە
تا پێت ئەگەم و دە مبینی
بە پلیکانەی سەد دووکان و بەر پاساژا
پێ هەڵ ئەزنێی لە بری ڕوانگە
کە پێت ئەگەم
فریا ناکەوم بتدوێنم
قەولی دیدارێکی دیکەت
لێ بستێنم
وەڕێ کەوتووی بەرەو دواوە
حەسرەتێکی جەرگ بڕت
تاقە شوێنەوارە ماوە .

## فوارەی جوانی

نیگات بارانی تیشکی زێڕوەشانی کاکەشانیە
کەشانی لاچاوێکی من
ئەگرێتە خۆ
ئەبێتـە هۆ
زمانی چاوم بێتە گۆ و
برینی کۆنی پڕ لە ئێشم بێتەوە سۆ
چ ڕازێکی یەزدانیە ؟!
زولاڵی چاوت چاوەیەک لەکانی ئاسمانیە
هـەر چـــی سامـاڵە لـەو دەکا
کـــە زینـدەوەر لـە خـەو دەکا
مـەجبووری ڕەو لـە شـەو دەکا
کە مانەوەی لە تاقەتی کەسا نیە !
ئەڵماسی تیژی تیشکی چاوەکانی تۆ بگاتە من
شەوارەیەک ئەداتە من
باوەڕ مەکەن وەشانەوەی لە غەیری ژن
لە جەوهەری ژنـــانیە
وەهـــا ئەڕازێنێتەوە خشڵێکی دوو جیهانیە !
ئەی شا گزینگی زێڕ بەزێن
فێنکترین تـەزووی تـــەزێن
بەتـاوی تۆوە چاوە گڕپژێنەکانم خور دەزێن
چرووکی تۆ ڕەوا نیە .
نیگات تیرێژی تیژی زێڕوەشانی کاکەشانیە
چ مانگە کوڵمەکانی تۆ لە بەر گزینگە کانیا
لە بەر پڕشنگەکانیا
لە ژێر برژانگەکانیا
ئەهای !

کە شیری ڕەنگی شیرنی ڕێی کاکەشان
چ کـاڵـە یـادی کۆڵمەکانیە
خەمێک بەرۆکی گرتووە پێم
بە کێ بڵێم
کە تێم بگات و تێ بگا کە چی ئەڵێم
کە شێـعری چـاوی سێحری ڕووت
کە سێحری چـاوی شێـعری ڕووت
فووارەیەک
لە جوانی جــوانی جوانیـە
لە جـوانی هەر زەمانیە !! .

## بەهانە

مرۆڤ بەهانە بوو
بۆ خوا ناسین
شێعر بەهانەیە
بۆ دەربڕینی ئەوینت
نە مرۆڤ
خوای دەرهێنا لە تەنیایی
نە شێعر هیچ
سازاندوویە
لە نێوانماندا تەبایی
شێعر و مرۆڤ بەهانە بوون
من وشێعر بەهانە بووین
نە خودادەکرێ پێناسە
نە تۆش
لە شێعرا دەگونجێ
وەک بێ ژمارەی هەناسە .



# کورتە باسێک لە ژیانی

## کەریم دافعی ( ک.د.ئازاد)

سالّی ١٣٣٩ لە ناوچەی سەردەشت لە دایک بووە .
خوێندنی سەرەتایی لە سەردەشت و خوێندنی راهنومایی لە بانە تەواو کردووە .
بۆ خوێندنی دبیرستان چوار سالّ لە شاری مياندواو خوێندوويەتی .ديپلۆمی هەر لە مياندواو لە سالّەکانی ١٣٥٦. ١٣٥٧ وەرگرتووە .



سالّی ١٣٥٥ بۆتە هۆگری شێعر و ئەدەب و هەر لەوساوە شێعری وتووە.
دوای شۆڕشی گەلانی ئێران و ئازاد بوونی خوێندن و نووسين بە زمانی کوردی هەوڵ شـێعری لە گۆڤـاری «سـروە » دا بـلاو بـۆتەوە .پاشـان لە زۆربەی گۆڤـارە کوردیەکان دا لە ناو ئێـران و ئورووپا و گۆڤارەکانی کوردی لە دونيا دا شـێعری چاپ کراوە .

* ئەو بەر هەمە شێعرانەی کە ئامادەی چاپن بريتين لە :

١. چبکەم تا تۆ نيشتمانی تازەی شێعرم
٢. قەت بەهارت لێ نەتۆرێ
٣. وەرزی ڤينێکی بێ وادە
٤. ياخـــی
٥. شەوگارناميَنێ تاکوو سەر
٦. پايزە خەم
٧. غەريبانە
٨. لـێرە دلّداری تاوانە !
٩. بۆ خەمێکی بێ کۆتايی
١٠. ياسای هەرمان

١١. کوایەک ڕەنگی دەورانی زوو ؟
١٢. خۆشەویستێکم هەبوو !
١٣. شەیدایی

ساڵی ١٣٦٣ لە شاری بانە بۆتە مامۆستای قوتابخانە و پێ بە پێی مامۆستایەتی لە زانستگای تەوریێز خوێندوویەتی و کارناسی ڕاوێژکاری (لیسانس مشاوره)وەرگرتووە . وبڕوانامەی لیسانسی خۆی لە سەر کوردی سۆران نووسیوە بە ناوی ( پایان نامە : معرفی ویژگیهای کردان سوران ).

ساڵی ١٣٦٨ وەک یەکێ لە دامەزرێنەرانی ئەنجوومەنی ئەدەبی لە شاری بانە تێکۆشانی خۆی لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی ئەنجوومەن دا پەرە پێ داوە .

٢٤ ساڵە مامۆستای قوتابخانەیە .

پتر لە ٢٠٠ شێعر و بەرهەمی لە گۆڤارەکان دا چاپ کراوە و زیاتر لە ٢٠ بەرهەمی ( بە شێوەی کتێب ) هەیە کە بێجگە لە یەکێکیان کە بە ناوی « چبکەم تا تۆ قەت بەهارت لێ نەتۆرێ » هیچیان بڵاو نەبوونەتەوە !

ئێستا بێجگە لە کاری ئەدەبی ، لە دەبیرستانەکانی شاری بانە و لە « مرکز مشاوره خانواده » دا وەک ڕاوێژکار خەریکی کارە .

# بۆ جودایی

زۆرم پێ وت :
ئەگەر مەیلی هەتاوت کرد
پێدەکەنم
پڕ بە کوێستان و دەشت و دەر!

ئەگەر تاسەی بارانت کرد
تێر تێر دەگریم
وەک بارانی بە بێ لەمپەر !

ئەگەر مەرگی منیشت ویست
ئەوە سەر و ئەوەش خەنجەر
بەڵام هەرگیز ڕازی دڵم
مەڵێ بە وانەی بێ خەبەر.

❊❊

زۆرم پێ وت:
سوێندم دا سەد سوێندی خوایی
بەڵام داخم
ڕازی دڵمی وت لە هەر جێ
بۆ هەر کەسێکی ئاسایی!
هەر ئەو کارەش منی هان دا
بۆ جودایی ،
بۆ تە نیایی !

# هۆره

تەورێ کەوتە ناو دارستان
بێ بەزەیی
بە دڵی سارد و سڕیەوە
گشت دارەکانی بڕیەوە !
❊❊
هەر دارێکی کە ڕادەنیشت
قرچەی دەگەییە ئاسمان .
دەت گوت گیاندارە دەناڵێ
لە مە ترسی مەرگ و نەمان .
❊❊
ئەو دارانەی لە تاو مردن
هەر هاوار و ڕۆڕۆیان بوو
کاتێ کە باش سەرنجیان دا
دەسکی تەور لە خۆیان بوو !

## گــومـان



لـه فرمێسكی چاوەكـانت
وەشك كه وتـم !
شەو ،
خەونم دی ، خنكاوێكم
لە ناو دڵی شەپۆلـی « گۆلی ورمێ » دا
دەخـولێمـەوە !

كە لـە بزەی ،
شیرینی تۆش كەوتمە گومـان ،
جیهـانم لێ بوو بـه زیندان
پێكـەنینی شێعرەكانم
هەموو تۆران !

## شەیدایی

دەستەکانم ،
بە ئاسمانی ئەوینی تۆ نەگەیشتن
لە جومگەوە لێم کردنەوە و
لە ئاسمانم هەڵاویشتن !

چاوەکانم ،
ڕووی دیتنی تۆیان نەبوو
ماچی سەرنێزەم پێ کردن
تا مەحرەمی بەژنی تۆ بن
هەتا مردن !

قاچەکانم ،
ڕێیان نەبردە جێ ژوانت
بە تیغی جەللادم بە خشین
تافرێنم بەرەو لای تۆ
مسۆگەرکا
باڵی ئەوین !

## ئاوێنە

وەک ئاوێنەی باڵانوێنی
من دەنوێنی ؛
هەر لە تۆدا خۆم دەبینم
گەڵای زەردی خەمەکانم
لە بەر تۆدا دەوەرێنم
زوڵفی سەوزی بەهارانەم
بەرانبەر تۆ دادەهێنم
هەرچی هیوا و دڵخۆشیمە
بە هۆی تۆوە دەنەخشێنم !
بەڵام ،
ئەگەر تۆش ڕۆژێکی
لێڵت کردم دەت شکێنم !

"لە قەفی گۆچانێک هەڵکەندرا بوو!"

## ڕق

ڕانە مەڕی ئەم چیایە
قەت نا بەخشن ،
ئەو گورگانەی ئێستا وەک سەگ،
دەلێسنەوە پێڵاوی شوان ،
کلکە سووتە دەکەن بۆ نان !

## جەقا

ئەمشەو پڕم لە یادی تۆ؛
وەکوو دەریا ،
لە شەپۆل و
وەک ئاسمان لە ئەستێرە !

❊ ❊

ڕەنگە دەریا بێ شەپۆل بێ و
ئەستێرەکان
ڕۆژێک ،
ئاسمان بەجێ بێڵن !
بەڵام ،
هەرگێز باوەڕ مەکە
شۆخی پەریم
لە مەبەولا ،
بێ تۆ بژیم !

## وەفـا

زۆر زوو ،
لـە بیـرت دەچمـەوە !
پێـش ئەوەی ،
مـانگـی گـوڵان بێ !
مانگی عەشق و
مانگی شـادی و ئـاشنایـی !

هەرگیز ،
فەرامۆشت ناكەم !
دوای مـردنیش
لە نـاو شێعـرەكانمـا دەژی
هەزاران ساڵ
پاش جودایی !

# ئاشـتـی

پـاش چەند ساڵان جیا بـوونـەوە ؛
کوندە بە بووی گۆڕستان و
داوەڵی ناو مەزرا و بێستان ،
ئاشت بوونەوە !



بڕیـاریان دا ، کە لەمەولا ؛
کـونـد ،
گۆرانی بۆ وێرانی قەت نەخوێنـێ !
داوەڵـیش ، کوند نـەترسێنـێ !
لەو بڕیارە ئاشتیەش دا
وتیان :نابێ ،
گوڵی ئەم لا و ئەولای پـەرژین
چیتر بژێن !



لەوە بەولا ، لەو مەڵبـەنـدە ،
دنیای داهاتـوو شایـەت بوو:
کوند گۆرانی    ئاوەدانی
گۆڕستانی گەورەی دەچڕی !
داوەڵەکەش ، لە ناوگوڵـی دەم پەرژینا
بەو ئـاهەنگە هەڵدە پەڕی !

# ژوان

بەهار بۆنی تۆی گرتووە و
خاکیش ڕەنگی گۆناکانت !

لە جوان وەرزی پێک گەیشتن
هەنگاوەکانم ، مامزی
لە ژێر تیغا دەرپەڕیون !

خۆت فەرمووتە :
هەوەڵ ڕۆژی باران بڕان
بەرەو کوێستان دەکەویە ڕێ !
وا فرمێسکی چاوەکانم وشکایی هات !

بڵێی دیسان بت بینمەوە
لە کۆتایی وشکە ساڵی پڕچاوەڕوان ؟

یان ئەمجاریش ،
گۆڕستانی شێعرێکی دیم ،
دەبێتەوە بە جێگە ژوان ؟!

## سەرگوزەشت



داره گوێزێک بوو بە سێ موور ؛
هەوەڵیان کرد بە سێداره
ملی جوانێکیان پێدا کرد !
دوو هەمیان شەق کرد بە مشار ،
کردیانە پرد !
سێهە میان داهێنایەوە
ئێستا تەختەیەکی پانە
ڕووی لە دونیای منالانە
منالەکان ناویان ناوه ،
« تەختە ڕەشەی قوتابخانە » !

## پەیکەر

« سیامەند » ێکم زۆر دڵگیر
لە ناو ڕکەی خەما یەخسیر !
بەتەشوێی بیر
لە مەرمەڕی شێعرەکانم
دادەتاشم پەیکەری تۆ
بەڵام هەی هۆ !
ناسکە« خەجێ »
ئەتۆ لە کوێ و
شێعر لە کوێ ؟!



## پێناسە

بۆ ناسینی پیاوی غەریب
پێناسە کەی چاو لێدەکەن ،
نەک چاوانی !

بۆ ناسینی میللەتێکیش ،
چاو دەگێڕن
بۆ شاعیر و
هونەر مەند و
نووسەرانی !

# پێـناس



شاعیرێک بوو بە دار بەڕوو
خەم لانەیان لەسەر چێ کرد !
شاعیر بوو بە بەفر و باری
خەم وەک منالٚ
شێرە بەفرینەیان پێ کرد !
شاعیر بوو بە کێوێکی وا
ملەی دەگرت لە گەڵ هەوران
خەمەکانیش بوونە باران
بەشەوق و تین پێی دا بارین !
شاعیر بوو بە دەریای دوور و . . . .
خەمەکانیش بوونە ماسی
خەمیان لە شاعیر کردەوە ،
کەس شاعیری نەدە ناسی !

کاڵێ ،
بەینێکە هیچ ناڵێ !



جاران سەراپا زوبان بوو
جاران سەراپا گوێ بوو .

کە زوبان بوو  هەر هاوار بوو
کە گوێ بوو ،
پڕ لە ترپەی دڵی شار بوو !



زوبانیان بڕی
گوێیان کەڕ کرد
وەک سەنگی مت
لە گۆشەیەک هەڵیان پەسارد !



لە جێی زوبانی بڕاوی
سەدان زوبانی لێ ڕوا !
لە جێ گوێچکەی کەڕ کراوی
سەدان گوێچکەی پێوە لکا !

بەڵام سەیرە !
زوبانی ئێستای بێدەنگن
گوێچکەی ئێستای کپ و وڕن !

تۆپی لە ژێر پێ دەردەکەن
ڕۆژی سەد جار
مرد نی خۆی نیشان دەدەن
وەک سەنگی مت  متەق ناکا !

کاڵێ ، پەری شێعری منە
کاڵێ ، ڕووحی شێعری منە
کاڵێ  کاڵێ  کاڵێ
کاڵێ بەینێکە هیچ ناڵێ !



## حـیـکـایـەت

ئـاوێنـەکان دەشکێنـن
بەڵام
بێ تـاوانـن !
بـەردەکانیش ،
هیچ نـازانن !

ئـەگـەر ئـەمجار
دەست هـی تـۆ بێ و
دڵیش هـی من ؛
باکت نـەبێ
ئـاوێنـەیەک دەشکـێ  دەشکـێ !

## ستەم

چوار داڵاشی فیلەتەنە
کەروێشکێکی برینداریان گەمارۆ دا !
وردە وردە چوونە پێشێ .
چاوی پاڕانەوە و
دڵی پڕ لە خەم و پڕ لێدانی کەروێشکەکە
نووسراوێک بوو ،
لە ئایەتی خوداوەندی و
لە دڵپاکی و ڕاستی و جوانی !
بەڵام جغار ! داڵاشەکان ،
خوێندنەوەیان نەدەزانی !



## با نگەواز

نیوە شەوێک ،
جووتە کەوی دەندووک سووری
سەر سنگی تۆ ،
دەیان قاسپاند !

بۆ بەیانی
هەر ڕاوچی بوو
بەرەو چیا ،
هەڵدەگەڕا !

## با وڕ

وردت کرد م ،
هەزاران جار !
پرژو پەرێشانت کرد م
بە هەر لا دا !
. وەک وردە خیزی گوێ دەریا
. وەک تۆز و خۆڵی دەم بۆمبا
. وەک تۆزاوی قەڵبەزەکەی «نیاگارا »!



هەمووجارێک
دیسان یەکم گرتۆتەوە ؛
بوومە گاشە بەردی چیا
بوومە دەریا .

❊❊

ڕۆژێک دادێ
چیایەک بم ، سەربە خۆبم
دەریایەک بم ،
دوور لە جادووی قینی تۆبم !

ڕۆژێک دادێ !
من دڵنیا م !
تۆش دەزانی!

## پاكانە



مشتێ ئاو بووم
تۆ بەستێنت لێ وەشاردم
پێت ئەسپاردم
زۆر بێ پەروا ، ببمە دەریا!
❊ ❊
پەیام بەرت بوون گوێ لە مست
بەرەو بەستێن
شەپۆلی سەركەش و ساردم
هەر تۆ ڕازی یاخی بوونت پێدا ناردم!
❊ ❊
مشتێ ئاو بووم
. ئاوی ئارام .
هەموو دەفرێ دالّدەی دەدام
فێرت كردم ببمە دەریا
فێرت كردم بگرمێنم
فێرت كردم بخنكێنم !

# مـتمـاخـه

لـەیلا وتی :
دەشت ئازاری تەنیاییمە !
من بـوومە کێو !

لـەیلا وتی:
کێو غـەریبیم لە قاو ئەدا
من بوومە چەم !

لـەیلا وتـی :
چەم ،
خـەمنامەی بۆ بڕانـەوەی بێکـەسیمـە
من بـوومە خەم !



دڵـی لەیلا داڵدەی دام و
هەموو ڕۆژێ ،
لە دەروازەی نیگای خەمگینـی کیـژی کورد
سەیری کێـو و
دە شت و چەم و
گـوڵانم کرد !

## داخ

چاوم خەندە و
دڵم یاد و
سەرم سەوداى تۆى تێدایە .
بیرم نایە
چەند پایزە
شادیم زیزە و
خەمم ،
چرۆى گوڵ بە دەمە!
زۆر ستەمە !
بەم جۆرەمان یەکتر دەوێ ، ٤٧
ئەمن لێرە و
ئەتۆش لەوێ !

## دڵنیا یی

بیر لە هەرچى دەکەمەوە ،
دەکەومە ناو شک و گوما ن !

زۆر دەترسم لە داهاتوو
زۆر دوو دڵم ،
لە ئاکارى دونیاى ئەمڕۆ !
بە لاّم لە دوو شت دڵنیام ،
وەفاى خۆم و
ئەوینى تۆ!

## هەرمان

لە سەر گەڵا ناوتم نووسی ،
پایز بە تاڵانی بردی !

لە سەر بەفر ناوتم نووسی
هەتاو غەرقی ئاوی کردی !

لە سەر وردە خیزی بەستێن
ناوتم نووسی
دەریا هەڵچوو
ئاسەواری لێ نەهێشتی !

لە دەفتەری شێعرەکانما
ناوتم نووسی
وەکوو شێعر بوویە نەمر
ئیتر هەرگیز ،
نەیان توانی بت سڕنەوە ،
ئاو و ئاگر !

# بـا ویلـکـه

وەک باویلکە ،
بە دەم شنەی نیگاتەوە ،
دێم و دەچم!

کە ڕوخسارت وەردەگێڕی،
لە قەراغی
وشکە ڕێگای چاوەڕوانی ،
بە جێم دێڵی !

❊❊

کەی دەستەکانتم بۆ دەکەی
بە هێلا نە ؟
وا پایزهات ،
وەخۆم ناگرن ئەو کێوانە !

سەرسام
چاوێکم وەرزی جستانە و،
چاوێک وەرزی گەڵاڕێزان !

تۆ نێرگزە ناسکۆڵەکەی گە رمیا نی ،
نە لە میانا گەشە دەکەی ،
نە لە ویانا ئۆقرە دەگری!

من نا زانم ، چبکەم تا تۆ
قەت بەهارت لێ نەتۆری !

## خۆشـەویستـی

من نـازانم لـە کـویێ دەمرم ؟!
نازانم کەی،
ئەجە ل ئـەدا لە دەرگاکەم ؟!
نازانـم چۆن ؟
بـە کام شێـوە ؟
بـەرە و ڕووی مەرگی خۆم دەبم !
نازانم ؟ ...نا!

بـە ڵام لێم ڕوونـە ئـەو کاتـەش ؛
لـە سـەرمـایـە،
سەودای عەشقی نیشتمانم
لـە دڵـمـایـە ،
خۆشەویستی کـوردستانم !

# پێش بیـنی

کاتێ چـرات کوژاندەوە و
ئاوێـنـەت بـەردەباران کـرد ،
دڵـنـیـا بووم ،
هەر دێیەوە !



من فـاڵچـی نیـم ،
شۆخی شەرمـن !
بەڵام لـێم ڕوونـە لـە مەولا ،
نـە من بـەبـێ تۆ هە ڵدەکەم
نەتۆش بـێ من !

## ژوان

هەر کاتێ دێ
بە پەلەیە!
دادەنیشی و
دڵی هەر وا بە پێوەیە !
بێقەرارە
چاوێ لە من
چاوێکیشی ،
لە سەعاتی سەر دیوارە !

من بە ودمی خۆشەویستی
سەرنجی ئەو ئەکەمە خەو !
ئەیلاوێنم
ئەفسانەی خۆشی دڵداری
بەگوێچکەیا ئەچرپێنم !

کات ، هەڵدەفڕێ
خۆر ، بە پەلە

بەرەو ڕۆژاوا پەل ئەکوتێ !
وەئاگادێ !

بەپەلە هەڵدەستێ بڕوا
خۆی ئەڕوات و

دەستەکانی جێ دەمێنن !
خۆی ئەڕوات و
قاچەکان ، خۆ ئەخافڵێنن !
تامەزرۆیە
تامەزرۆتر لەو کاتەی دێ
تامەزرۆیی ، تەلیسمێکە بەتاڵ نابێ !
ئەڕوات و ئەگەڕێتەوە !
ئەڕوات و ئەگەڕێتەوە !
ئەم چیرۆکە هەموو ڕۆژێ بەردەوامە و
نابڕێتەوە . نابڕێتەوە. نابڕێتەوە !

## ناسۆر

« سیامەند » لە کێو
شمشاڵی خستۆتە گریان
منیش لە ماڵ،
شێعری« نالی » دەخوێنمەوە !

لە داوێنی« برایم جەلاڵ »
« خەج » شیر مەشکی بە کۆڵەوە
بەلا ڕێدا هەڵدەگەڕێ
بە بالۆرە جوابی شمشاڵ دەداتەوە !

بەق و چیلێک
ئەم بەرانبەر ، بۆ یەکتری دەستێننەوە !

لە بژوێنی پەنا چیا،
لە سەرەوەی « کانی مورادان »
جوتێک دڵدار پێک گەیشتوون !
لەو لاشەوە
لە سەر گوڵ و سەوزەی ژاکاو
کۆنە شمشاڵێکی خامۆش ،
بە سەر شیرمەشکی خاڵی دا شۆڕ بۆتەوە !
منیش لە ماڵ
شێعری "نالی "دەخوێنمەوە
تۆوی گوڵیادی "حەبیبە "ی نا مورادم
لە دەروونما دەچێنمەوە !

# ئەفسانە

باش دەزانی خۆشم دەوێ
باش دەزانم خۆشی دەوێم!



کە دەست دەخاتە ناو دەستم
دادەگیرسێ وەکوو سۆبە ،
گەرم گەرم !
ماچی دەکەم ،
دەتوێتەوە
دەبێتە شەونم و شەرم !



لێم نزیکە، وەکوو نیاز
وەکوو ڕەگی گەردن و خوێن !
چاوەکانی، جووتێ مەلی بێ ئارامن
بێدەنگ لە گەڵ منا دەدوێن !

کە چاو دەبڕێتە چاوانم
هەست ئەکەم خەم
ئەدا لە شەقەی شاباڵ و

پەپوولەی ڕەنگینی ئەوین
دا دەبارن بۆ دیوەکەم !

لێم نزیکە !
هەرچەند جار جار
لە مەڵبەندی نامۆیی دا ،
ستار ئەگری و
ڕەشماڵی خۆشەویستی خۆی
بە هەر لا دا
بە کوێستانی ئاواتم دا دەگێڕێت و
تەنیا جارێک هەڵی نادا !

ئەو حەز ئەکا ؛
لە مەڵبەندێکی دوورە شار
لە چۆڵێکی بێ ڕێبوار
لە ماڵێکی میچ قوڕماوی ،
هەر دوو بە دوو
وەک دوو مەلی شە یدای ئەوین
ئازاد بژین !
ئەو ئاوی کانی بێنێت و
سفرەی ماڵمان
بە نان و ماستێکی سادە وەڕازێنێ !
بە شەربەتی تووترک و
شیلان و شاتوو
هیلاکی من وەحەسێنێ !

منیش وەرزێری عەشقی بم
شەتڵی بڕوا بگووڕێنم
تۆوی ئارەزوو بچێنم
بە دوور لە خەم
مەڵۆ مەڵۆ
گەنمی ئەوین دروێنەکەم !



من حەز ئەکەم ؛
لە بەر دەمی
کاکێشانی چاوی خەڵک
چیمان هەیە بی نوێنین
چیمان دەوێ بی ستێنین
ترس و شەرم و بێ بڕوایی
بتارێنین !



ئای لەو کاتەی بەیەک دەگەین!
دەستی دەگرم ؛
گەرمترین بورکانەکان دەتەقنەوە !

پێدەکەنێ ؛
ڕەنگین ترین گڵۆوکەکان
ئەپشکوێن !
سەر دا دەخا ؛
پۆل پۆل ، پۆل پۆل وەنەوشەکان

دێنە سەما !

سەر هەڵ دەبڕێ ؛

بەرزترین دوندەکانی کوردستانم

ئەشنێینەوە !

سەری ئەخاتە سەر شانم ؛

لە عە رشی خوا ئەخولێمەوە !

بێ دەنگ دەگری ؛

دەبمە پاشای کیشوەری خەم !

بەجێم دێڵێ !

گرێی دڵم

گەورە و گەورەتر دەبێت و

گەرووم ، دەستێکی پۆلایی دەیگوشێت و

دێمە سەر چۆک

وەک خاک و خۆڵ

لە سەر زەوی بڵاو ئەبمەوە

دەبمە ناوی بێ ناوەرۆک!



کە دائەنیشێ ڕوو بە ڕووم

نازانم کێم!

ئەو کوت و مت ئەبێ بە من

من کوت و مت ئەبم بە ئەو !

کە قسە ئەکا

گەشە ئەکەم وەکوو گیا !

کە قسە ئەکەم،
سەر دائەخا
گوێم بۆ دەگرێ ئارام ئارا م
من دەریایەک لە ژێر پێم دا
ئەو
سەنگەرێکی بەردینی دوندی چیا !

هەموو چاوێک
ناتوانێ ئێمە ببینێ
هەموو گوێ یەک
ئاشنا نیە بە قسەی ئێمە !

ئێمە خەڵکی
وڵاتێکی ئەفسانەیین !
بە زمانێکی تر دەدوێین !
جۆرێکی تر
دەڕوانینە چاوی یەکتر
جیاوازترە لە هەموو کەس
خۆشەویستی و دڵداریمان !

گەورەکانمان
لە مەرگ و شۆڕش ئەترسن
لاوەکانمان

لە داهاتووی نادیار وبێ بڕوایی
ئێمەش هەر دووک لە جودایی !



حەز ئەکەین
لە ژێر بن میچی ماڵێکا
وەک دوو مرۆڤ
بژین ، بمرین !
حەز ئەکەین ، بە یەک بگەین !
بە ڵام جغار !
لە نێوانمان دەریایەکە ،
لیپاولیپی بەدگومانی و
نەریتی کۆن !
هەموو قەوانە شڕەکان
لە جودایی ئێمە دەدوێن !

کاتێ بەرەو لای یەکتریش
هەنگاو ئەنێین
لە سەر ڕێمان ، لە بۆسەدان
هەزارەها
خەنجەری ڕووتی عاشقی خوێن !



# محەممەد سدیق کەریم پوور

له ٦٠/١/١ له بانه له دایک بووه دیپلۆمی هەیه و له ساڵی ٧٤ وه هاتووه چووی ئەنجومەن دەکا و له ٧٩ بەدواوه چەند جاران ئەندامی لیژنەی بەڕێوە بەرایەتی بووه و دوو جاران بەرپرسی ئەنجومەن و دەبیری بەریوبەرایەتی فستیواڵەکانی چوار و حەوت و هەشت ی چیرۆکی بانه بووه و جێگری بەڕێوە بردنی فستیڤاڵی شەش و ئەندامی نووسینگەی فستیڤاڵی سێ و پێنج ی چیرۆکی بانه بووه و له زۆر یەک له شەوه شیعر و فستیڤاڵەکان بەشدار بووه و سێ کۆمەڵه شیعر"جیابوونەوەی کریستاڵی" دیتنەوه"ئافراندن"و دوو کۆمەڵه چیرۆکی "شەمشەمه""دۆنا"ی ئامادەی چاپەو کتێب گەلی "کێوه نەناسراوەکان له ئاڤێستادا" نووسینی عیمادەدین دەوڵەت شاهی کرماشانی" سترانەکانی قەرەچ" فێدریکۆ گارسیا لۆرکا "بیرەوەریەکانی ئیرنێست و چێگڤارا " وەرگێڕانی محەممەد عەلی عەموویی "شۆرشی" باگوان ڕاجنیش ئۆشۆ کۆ چیرۆکی "ئیتر هیچکات تۆ نابینم" وەرگیڕاوی محەممەد عەلی مهمان نوازان وچەند چیرۆکیکی هیدایەت و" پیره پەپوولەکانی ئیواره" ی شیرزاد حەسەن و ... وەرگیراوەتەوه و نامیلکەییک بۆ ڕینووسی زمانی کوردی و نامیلکەییکی دی بۆ ڕیزمانی زمانی کوردی داناوه .له سایتەکان و گۆڤارەکانی ڕامان و سروه سوورێنی نوێ و.. بەرهەمی بڵاو بووەتەوه.

# من وخوا

( بۆ سەر کێلی گڵکۆکەم )

ئەوەندەی کە دوو چاوی من
نزیک لە چاوی خوایە
بڕوا ناکەم چ چرپەیەک
بگاتە ترپەی دڵی خوا
لە دەشت و سارا و کوێستان و گوند و چیا
لەم جەستە نوقم  بوە لە خوا
نە من جێگام گۆڕستانە
نە گۆڕستان جێگەی خوا

# ئەمە کۆتایی نیە سەرەتایەگەر بمانهەوێ

وا لە ناخی هەناسە مانوەکانەوە
دووکەڵ و تۆز
کەوی دەکرێ
لەم بەرەهووتە ماندوە
کە وەکاز کوێری لە گلارەی خواستەکانی تۆقاندوە
سەرەتا نیە سەرەتا
هەنگاوێکە دۆش داماوی دەدرکێنێ
ڕەوەندێکە پووزوی هەنگاو دەڕووشێنێ
بێ ئەوەی ناخ مەتمانەی بە ناسین کردبێ
ئاوازێکی ئەهوورای، تیشکاوی
لیپاو لیپی هەڵچوون و داچوون
ماچ دەکا
ماچ دەسپێردرێ بەو دۆخە تەم گرتوانەی
تیشک فام دەکەن
وەیان نیە بۆ هەندەسە
تێکشکاندن نا تارێنن
ناخی سەفەر سەفەر دەکەن
بۆ ناساندنی ناسیاو
بۆ دیتن و شاهیدیدان

٦٣

لە هێڵی پێچەڵاو پلووچ
کەگازێ لە هەنگاو دەکا
من ماچێکی بێ ئۆقرەی خۆ خەیاڵ دەکەم
بۆ فام کردن
لە ژێر رەفیسکی هەر کانییێک
کە گوڵە چوالەی دەق نەشکاو
شەپۆل شەپۆل بۆ پێش دەبا
وەک ئەو کوڵمەی ئەنگوستەکانمی دەفاماند
نە دەتارا
تارای سپی لێ دەهاڵا
بەرێ دەکرا
تا لە ناخی ویستە ئوقرە گرتووەکان
جێگە وەکا
خۆ فام بکا

# فام و باران

له وەرزێکی ساڵی نەهات
لەدوای ئەوە کە دواهەم سوار
خەونی ماندووبووی ڕێبواری
 له هێڵەکی چاوەکانیا
هاوتەریبی تروسکەی جوغزە ماندووەکان
 دەردەخست و دەیدا بە با
من ڕێکەوتم هەنگاوم نا
ڕێ ڕێم پێوا
چاوە دا پۆشراوەکانم
لەتاقی ماندوو بوونەکان دا وەردەدا
کەس نەبوو چۆڕێ بیر وەکا
کەس نەیفامان
 کەس نەیدەویست بیدرکێنێ
کامە گوڵ یەخەی خۆ دەدڕێ
کام تروسکە تیژی لەمن و ...
کام نامۆیی خۆ لە دەروونتان وەردەدا
لێرە هەور بە ڕندوکی چاوانتان خۆ..

خۆی تێر دەکا
دادەبارێ
لێرە هەور بە مووچڕکی لەشی ئێمە..
ئێمە دەتریشقێنێ باڵا دەکەن
خۆ فام ناکەن
ناسیاوی تاسەگرتووی نەهاتنن
لەساتێکی هەزار هەزار
پاش حەزێک سۆزێک مەودایێک..
هیچ نەتان ویست یەک وەبینن
نەتان زانی و نەتان توانی
ماچەکان لەتاڵە لەراوەکان دەربکێشن؟
بۆ ناخی شار
نەتان فامان
هەروا منتان لەژێر فێنکە باراناوی هاوینە هەوارەکان
دوور خستەوە
بێ ئەوەی کە هەست پێ بکەن
ماچ و باران
دەست بخشێنن
بە گۆشە و ناوقەی لەچکە گوڵ سوور سوورەکان
وەبیرێنن نەتانفاماند

## ئاشنا



من هەناسەی دڵدارێکم لە ناخایە کە نایناسن
ئاشنایە
من بریسکەی خۆشەویستێ لە چاومایە
کە نایناسن
ئاشنایە
ئەم پێدەشتە
لە سنووری گومبەزە سەوزەکانی دەروون
ڕووی لە خوایە
ئاشنایەو ئاشنایەو ئاشنایە



## هونەر ە

دار تاش شەوێک
کۆتەداری دانیشتنی
بەر قاوە خانەی دەتاشی
کۆتەرە بوو بە پەیکەرە
هەر ئەو شەوە
بایەخی کۆتەرە گۆڕا
ئەستێرەکان سەریان سووڕما
بۆ بەیانی
پێناسەی شار بەو سپێرا

# دابڕان

تۆ لە سووچێکی گوناح و
من لە خێڵی تاوانباری
تۆبانگ دەکرێی بۆ دوا کۆڵانی نامۆیی
منیش بەرەو دابڕاوی
ناخ تاسەییێک دەیگرێتەوە بە ئەسپایی
بۆتۆ دەلوێ
تۆ لەچکەکەی سەوزی سەرت بە چاوەکانم دەسپێری
من ماندوویی
تۆ هەندێ لێم نزیک دەبی
هاڵاوی دەم ، نێو چاوانم دەگرێتە خۆ
من تاو و توێی دڵگیراوی
تۆ باخێ وردیلە خەیاڵ بە چاوەکانم دەسپێری
من هەندەسەی بێکۆتایی
لە ناوەختە ناوازەکان
لەو هێلانەی هەنگاوەکانیان دەبژاردن
تا نزیک کۆڵانەکانی ناسیاوی
ونم کردی بە ئەسپایی .

## خەییام ڕابە !

دوور بەرەو پیری نزیکی یەخە دەدڕێ
نزیک لە دوور دەردەکێشرێ
منیش لە نێوان ئەو جووتە
ماندوانە دەبمە ڕێگە
چاوەکانیش لە ناوەندی وەکازێکا
پەنا دەگرن
وەکاز دابین کەری ڕێگا
هەنگاو کەوی
سەر لە خەڵوەی ناخە فیروزەییەکانا
تاتکە دەکا
بدرکێنە
ئەهای خەییام
لێرە لەلای ئەم جۆبارە دەستکردانە
لە باوەشی ئەم کۆڵەکە سێ گۆشانە ، چوار گۆشانە
بیانوو بە چی دەگری
بیانوەکان بە ڕاڤەی هەرەسهێنان هەڵتۆقێنە
ڕابە ئەدی
ورە لە دەستکرد وەسێنە

حەز لە تەنیشت بەختە باران
جێگە بکە
هەندەسە ساکارەکانی نەخواستووت دارمێنە
لەو هەشت گۆشە وەرە دەرێ
دەست لە بەرۆکێ بخشێنە
هەندەسەی وەکازەکان بدرکێنە
دەهر بەناخ بتارێنە
ترووسکەی چاو بێ داسەپان وەلاوێنە
رابێ ئەدی
منیش لە نێوان ئەو جووتە بێ ئۆقرەییە
وەحەسێنە
رابە ئەدی
بێ چاو شارکێ بمناسێنە
ئەهای خەیام
زرینگەی سواڵەتی ورد بوو
لە جەستەدا بدرکێنە
رابە ئەدی
یەخەی قەڵشاو
بێ دەست بردن وەلکێنە
رابە ئەدی
لە ناخی وەکازەکاندا بمفامێنە

# عەبدانی خوا



عەبدانی خوا !
سەر ڕاسترین مرۆڤەکان
پێگەکانی متمانەتان
ڕووبە ڕاستە چاوگە ڕاخەن
تا پێکەنین
تامی خۆشی بریکاری لە سەر لێوتان
لە سەرجەمی دۆخە تورت و ناسکەکان
بە میوان بێت
عەبدانی خوا !
خۆتان زوڵم لە خۆ دەکەن
ئاگا / بە ئەنگوستی گاڵتە
تاوان بارو
قین و نەفرەت دادەتاشن
دەبیچێژن
ترس و خەفەت
عەبدانی خوا !
بریکاری بە جێ بێنن
متمانە دارێژنەوە
ئەفسوون بکەن بە دەم کات و دۆخی پچڕ
عەبدانی خوا!
لەم هەرێمە خەڵووزاویە...

## كۆڵ نەدان

هەموو شەوێک
تۆ لەناخی سلوولەکانی مێشکمدا
دەر دەکێشم
دەتسڕمەوە
کەچی بۆچی
گشت بەیانییێک لە شوێنی خۆت
نیشتوویەوە / نافامێنم

## گومان



ساڵگەلێکە
لە ئامێزی خەونەکانما
کیژۆڵەیەکی بەرگ ڕەش
خۆ دەنوێنێ
ساڵانێکە لە بەر چاوما
لە کورتترین خەیاڵەساتی بینینما
ئەو بەرگ ڕەشە پووڵەک سەوزە
سەما دەکا
دەست دەکێشم و نایبینێ
لەو دیو تەمی چاو نەپێکراوی ژوورەکەم
پێدەکەنێ و جەستەم دەبا
نوقمم دەکا
لە باوەشی پێدەشتەکانی دڕۆنگی

# خواست

دە سەر هەڵبڕە
شەو و شنەی با
ئاوقای حەزێکی بێوچان دەبن
لە ناخی مەند دا
پەنجەرە پردی نێوانمانە
با غوربەت شاری ئابلۆقە دابێ
تا بۆنی عەترت ـ کاتی ڕامووسان ـ
جەستەی ماندوومی سووک خەملاندبێ
خەرمانەی جەستەت بە گێژەڵۆکەی دووریم ناسپێرێ
با پەنجەرەکان باوەشی مەندیان ئاوا نەکرابێ
ئەستێرەی ئاسمان
بە ئارەقی لەش ڕازاوەتەوە
ئەو دەمەی خۆری خۆشەویستیمان
ئاوەنگی تیشکی چرۆی کردبوو
پەردەکە لادە
پردی نێوانمان ئاوەڵا کەوە
لەم ژێر گڵەدا سەر هەڵبهێنە
بەهارنارنجی سەر پرچەکانت بەبا بسپێرە
دە سەر هەڵبڕە
شەو شنەی با ...

## دیمەن

لە چیای زنجیرە بەفرین
باوەشێک پـلکانەی ماڵین هەڵچنراوە
سەدان حەزو تاسەی ڕەنگین داڵدەی داوە
لە ناخی قەڵایی مندا سیگارەڕێ مەودای دەوێ
تا چریکەی دوو ڕەهێڵەی گۆڕەوشان بۆ یەکدی بەرێ
قەڵا: تاڵان
نیگا: سەرژان کەوتووی ڕە هوار
ڕاکێش دەکا تا گەیشتن
بەبریسکەی کەژاوەی ژیان
چ بەفراوە
لەم دیمەنە
سپی پۆشی بەرەو چیا
خورەش دەستی بەرەو نشێو ڕاکێشاوە

# ئەم بەراو بەری پەنجەرە

باران دەبارێت و من سەر تاپا دەخووسێم
باران دەبارێت و هەنگاوەکانم شل دەبن
باران دەبارێت و ڕێگاکان مەند دەبن
وە من هێور هێور دێمە ناخت لەم بەر پەنجەرە
تۆ نیگاکانت لە هەرمانێک دەبڕی
وە من هەناسە بێپەناکانت داڵدە ئەدەم
وە من خەونە نەوتراوەکانت ڕاڤە دەکەم
وە من ویستە دەروونیەکانت کەوی دەکەم
تۆ ماچەکان بە لێوتەوە نالکێنی
وە من گۆمبەزە شینەکەی هاوارت بۆ ڕەهوار دەکەم
تۆ داڵغەکان پەنا نادەی
تۆ تاسەکان کەوی ناکەی
من پەنجەرە دەکەمە چوارچێوەی جەستەت
تۆ ئەنگوستت بە شیشەدا دەخشێنی
تنۆک تنۆک باراناو جۆگەلە ،جۆگە دەبەستێ
ڕووخسارت پڕ لە پێکەنین
ئەم بەر پەنجەرە پڕ فرمێسک
باران باریوەو من خووساو

تۆش ون لە بیرۆکەی ژیان
باران،  پەنجەرەو دەستی تۆ
ژیان قاپ و خواستی من
هەتا دوایین هەناسەو ژان



## خۆشەویستی

لە دوورترین شوێنی شار
خەونی دابڕاوی مەلێ
دەشەمزێنێ ڕوومەتی ئەو کاروانچیەی
کە ئەوین و خۆشەویستی
بە قاچاخی بۆ شار دێنێ

# خولیای وڵات

کیژێکی شەدە بابردوو
خەونەکانی بۆ شەپۆلی زەریا دەگوت
چاوی مەستی ماسیەکان ئەسرینی سووریان بۆ دەڕشت
هەتاو لە چەقی ئاسمانا حەبەسابوو
شەدە بابردوو گۆرانی
بۆ شەپۆلەکان دەچریکان
ماسیەکان لە نێو ئەسرینی خەستیانا سووک دەرەخسان
مانگ بە شاباش تریفەی سەوزی دەباراند
کچ بەژنی خۆی ئاراستەی شەپۆل کردبوو
شەپۆل بوو بەژنی دەلەراند
ماسیەکان هێڵی نیگای تاساوییان
بە تارمایی پاش کچ دەسپارد
هەوری ئاسمان دەیبریسکان
بیرەوەری شەدە و کچی لێک دەهاڵاند .

## شەهید

کاتێک چاوت بڕیە چیا
چیا لەرزا
کەچوویتە نێو لەشی زستان ساواق تۆقا
کە بەرەو پیری گوڵکان هەنگاوت نا
گوڵ هەستاو لەبەر قاچتا چۆکی دادا



## تەنبـــوور

تۆ تەنبـووری
ئەفســـوناوی
چی لێت دوور بم
زیاتر کێشـی خۆتـم دەکەی
موغناتیـــسی تـلیـسـماوی
ئەفـســوناویـم
هەر چی دەکەم لە ناخی ڕەنگاڵەی تەما
هەر پیت ناگەم

## تۆتێم

تۆ خۆت لە ئاوێنەی چاوانتدا
چێ بۆ نەکرا
سەرپەنجەکانت کرۆستەوە
کەکۆڵ کۆڵ مەندی لێ دەتکا
لەوەرزی بارانی سوور و
خەونی سپی
تۆ خۆت لە ئاوێنەی چاوانتدا
چێ بۆ نەکرا
تا پێکەنین گەمێ سازکا و
بە پێدەشتی هەناسەما
تێ بپەڕێ
تۆ خۆت لە ئاوێنەی چاوانتا چێ بۆ ناکرا

## پەیام بەر

لەو کاتەوە لە دوورگەدا
سەرشێتانە
خەمی عەشقم لە چاوی زەریا چەقیوە
هەموو نەهەنگە عاشقەکان
بەرگە ناگرن
دەچنە کەنار
تا عەشقی من
بەگوێی کەنار ڕاگەیێنن  و سووک بمرن



## هەڵاڵەی سوور

کاتێک کەڵە کێویەکان
بە بێ تاوان شەهید کران
هەتاو سووتا
خۆڵە مێشی لە ئاسماندا
ئەسرینی ڕشت بەسەر خوێندا
لە جێگای خوێن هەڵاڵەی سوور سەری هەڵدا

## ئاوێته

لەئەوپەڕی سنوورەوە
نیگاهی تۆدەبێتە گورگە زێ
هەتا لە باوەشی شووشە بەندی دووکانەوە
بچێتە ناخی سوورە گوڵە سەررێکی مەند
تا لە ئامێزی چڵە چڵەی قژە سەرتدا داسکنێ
ئەمن لەتاوی تاسەی چاوەکانی پڕ حەزت دەبم بە ڕێ
لە ڕێوە باس ئەکەم کە ڕێگری ڕەوانە بوو
ڕچەی ڕانەمووساوی لیوە دەق نەشکاوەکەت کەوی بکا
شەکەت دەبم
لە ئەم بەری شەقامی هاوتەریبی شەکانەوەی جەستە نەرم و نۆڵەکەت
بیرۆکە کرچ و کاڵەکەت
پلە پلە هەڵدەگەڕم بە پەلکە کەژ بەسراوەکەت
خێرا خێرا تێدەپەڕن
ویژەو دووکەڵ جێدەهێڵن
بەهاری پڕ گوڵە چوالە سەما دەکا
وەسووڕی خەرمانەی جەستە تەماویەکەت
هەواری پڕ هەناوی دوور

٨١

لە تورمز و
سوورە مۆڕەکەری چرای سەر هێڵی سپیە دەق بەستەی
ڕەشی شەقام
چ تافێ بوو ئەو دەمەی
دوور لە دەستی پەنجەرە
بەها نارنجی خەونەکانی کازێوەت
بە گوڵ ئەرخەوانی نیگا ڕەهوار دەکرد
دەتیپەڕێ و وەرە
لە ئەوپەڕی سنووری نیگاتەوە وەرە
وەرە جیا لە جیرەی توورمز و هۆڕین و دووکەڵ و وڕە
چرایە سوورەو سەوز نابێ
سوورە تەلە سەر دەس نادات جێبگرێ
منم بۆ ماچی لێوەکەت
ژیانی تۆخی ژێوارم دەکرد نەوی
نەبووی لە شا دەماری خواستێ مووشتەری
گوڵە سەرێکی سوور بوو چاوتی تەنی
شووشە بەند جێدەهێڵی
سوورە چرا مەودا نادا
بەژناو بەژنی خەیاڵستان لەناختا ئوقرە بگری

...

خەونم دیبوو
هاتبوویتە سەر ڕێگاکەم
دوێشەو دەڵێم
لەگەڵ یارە گیانی گیانیەکەتا
دەستمان لەنێو دەستی یەکا
بە بەر دەمتا تێدەپەڕین
قەڵز مەبە
خەونەو دیومە



## ئافراندن

تۆیان بۆ من ئافراندوە
لەم بەر سنووری چاو شارکێ و
لەوپەڕ هەناسەی خەونەکان
تۆیان بۆیە ئافراندوە
تا
بەر بەیان و ئێواران
ئازارم دەی
بێ ئەوەی بە خۆت بزانی
کە تۆ ئەری
تۆیان بۆ من ئافراندوە

## سڕینەوە

بۆ هەوەڵ ڕا
کە چاوی خوا
کەوتە چاوم دونیا گۆڕا
ئاسمان ڕەنگی شینی تۆرا
مێشکی تورتی تاسە گرتوی
هەندەسە ئاڵۆزەکان
داچلەکا
ژیان تارا لە وەنەوز دان
من ئەونما
من بوون بوو کە دادەچۆڕا



## کەژاڵ گوڵ محەمەدی

له ساڵی ١٣٦١ له شاری بانه دایک بووه ؛ خوێندنی سەرەتایی و تادەبیرستانیشی

هەر له شاری بانه تەواو کردووه . له ساڵی ١٣٨٥له زانکۆی پەیام نووری سەقز ٨٥

کارناسی دەروونناسی وەرگرتووه .له ساڵی ١٣٧٢ دەستی به نووسینی شێعر کردووه

وهەروەها له ساڵی١٣٨۴ وەله ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنی ئەدەبی بانه

بووه و ساڵی ١٣٨٥ که بەشی منداڵانی ئەنجومەنی ئەدەبی دامەزراوه بەرپرسی ئەو

بەشه بووه .کۆمەڵێ له شێعرەکانی بۆ چاپ ئامادەیه .

## چەندە ماندووم

گوڵ تەلاری خۆشەویستیت
بەرە ولووتکەی ئەوینێکی بێ کۆتایی ڕام دەکێشێ
گومبەزیەکان ماندووی کەوتن
بڕواناکەی
تۆراندنیش مەوادی وەسڵ دەڕەخسێنێ
مرۆڤەکان چەن چڵکنن
خەفەت لەیەک ناسڕنەوە
بڕواناکەی
تەنیا دەڕۆی
هەیهۆ لەدەستە پارەتا
کۆ لێ خەفەت دیاری منە
چەندە تینووم
من ڕاهاتووم
گۆزەی حەسرەت داچۆڕێنم
ئێستاش تینووم
بڕواناکەی

ئاورێ وەدە
چەن نەگبەتن
ساتە یاخی و نەسرەوتەکان
ئاورێ وەدە
چلۆن بڕوا بەخۆت ناکەی
هاوار لە من هاوار لە تۆ
لەکاتە بێ ئیجازەکان
بارەگای شەوچەن بەرینە
مانگ شکۆی شەوی پێ ناشکێ
بڕواناکەی
هەموو خەوتووین
بریا خەوتباین
هەمووخەوی خەودەبینین
عەزەمەتە  بەرەوتۆچوون
گەڕانەوەش دەردی کاری
چۆن وەگەڕێم مەودائەدەی
لەم وەختە بێ وەختانەدا
جریوەی چۆلەکەکانیش
ئاهەنگی ڕۆشتن ساز ئەکەن لەم کاتە بوولێڵانەدا
بانگەوازە
بانگە ، گازە ؛بڕوا ناکەی

## شێعری سپی

بۆنووسینی شێعری سپی
وشەی هەموو فەرهەنگێکم وەها ڕاوانا
تەنیا وشەی تۆ بەجێ ما
تۆشم لانا
لام کردەوە
هەناسەشم لە لا نەما

## چاوەڕێ



لەچوارقوڕنەی ئەم دونیایە
چاوەڕێتم
حەزیاکان حەوت فاتیحەی مەرگیان بۆخوێندووم
بەخاترخوا
خرینگەی نیگا کانت وای شێواندووم
خەم و خۆشی لێم یاخی بوون
ڕەش بەڵەکیان لە بۆ گرتووم
وەرە ئەی ڕەشکارە وەرە
لەم ڕەشە ساڵە دڵتەنگە
لەم ڕەشە گاوربتۆرێنە
مووفەڕکە ڕەشکەو پێشکەکەت
لە سەر دڵم ببارێنە

## ئەوین

ئەوینی تۆ
گیاشینی لای ئێوارانە
هەمووکاتی زەردە پەڕێ
پڕ ڕەنگ و جوان ئەشنێتەوە
بەڵام کاتێک ڕۆژی ڕوون هات
چاوم لێڵی بیردێتەوەو
ئەوینی تۆش کاڵ و کاڵتر دەبێتەوە ..،



## لەشوێنێکی نامۆ بەشار

هەناسەکان
بۆنی بەهەشتی خوا ئەدەن
لەشوێنێکی نامۆ بەشار
هەناسەکان
مات و حەیران
هیچیان ناوێ
بۆتێکەڵ بوون دۆعادەکەن
لەشوێنێکی نامۆ بەشار
هەناسەکان
ئەنگوستەکان

...

دەنکێک خورما

مانگ وده ڕۆژی بێ ڕیا

بۆسفره ییێکی بەردەمی

دەروێشی بێ نەوا دەبەن



## چاوەکانت

هین نەجیبن

هەرچەن مەحوی تەماشام بن

مەنعیان ناکەم

بە لاّم من لەوە تێناگەم

دڵی ماندوو

لەدووریێیان

چەند بەترپە و چەند بێ لێدان

## چەندە تینووم

کەلێوم ئەگاتە لێوی
بەحەسرەت تەزیوی لێوان
کە فینکایی ناگاتە دڵ
زرم دەشکی
چاوەڕوانی و شکۆی شێوان



## تەفسیر

ئەمرۆ کەمەستی چاوت بووم
پەپوو لەبێک هات نیگاکان
تەفسیر بکا
تا بینی بزەییێکی سەرلێو
باڵی گرت و لە لام نەما

# سەراب

هیچ کاتێک لەتۆ تێناگەم
هێندە نامۆی وەک سەرابی
بەڵام گیانە بێ بەڵا بی
ئەزانم قەت بۆ من نابی
بەڵام خۆزگەلای جەنابی
قەزا و قەدەری ژین وابی
ئە تۆش ئازیز سەرلێ شێواو
بە دەردی من موبتەلابی



...

ساتەکانم وایاخی بوون
کاتێ بێ تۆ
زەمان رادەوێستێن و
ئێزگەکەیشی خەوێکی دەقیانووسیە

## خەم

خەمەکانم مەڵۆ مەڵۆ
لەخەرمانی دڵ داناوە
نیوەشەوی دابڕانەو
بیرەوەریت
مووچەرکە و تەزووی نەمات
بەڵام ئەمشەو
لە نێو حەزی عەشق و نەمان
حەزێکی نوێ
سەرهەڵ ئەدات
ئازیزەکەی سەرنوورم
دڵنیابە
دابڕانی من و ئە تو
لە وانەیە قەت ڕوو نە دات .........!



# ئەبریزەی میرزایی

**ساڵی ١٣٦٢لەدایک بووە و لە ساڵی ٧٩ وە ئەندامەتی ئەنجومەنی وەرگرتووە ولە واحیدی شێعرداکاری کردووە ،لە ساڵی ٨٥وە ئەندامی لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنە .**

...



به من ئه لێن چاره نووس
چاره نووسي من سووتاني ڕێته
سه رم له به ر پێته
هیوای من گرێ عه شقته
تکاي من ڕه حمي تۆیه
ده ستم بگره
عه شقي من شێتانه ترین ویستنه
ئه سیري تۆم
وێراني تۆم
سووتاوي تۆم
تۆ بۆ لێم ونی

...

له ته ئا وینه كه م ده ر ئه هینم
بنیایه‌مێكی خنكاو تماشام ئه كات
غه ریب و ته نیا
مردویه‌كی ژه نگاوی
ڕۆحێكی تۆزاوی
بانگم ئه‌كات
هه‌ستێكی ڕوون چه‌پۆكم پێدا ئه‌كێشێ
ئه‌بێ ده نگه شكاوه‌كه ی
مافه ون بوه‌كه ی
زیندوو كه‌یه‌وه
ئه‌و وون بوه‌ی كه قه‌ت نه یان هێشتوه
خۆی بناسێ

95

...

غه رقی نیگای تۆیه
بیرو خه‌یاڵي من
شێوام نه ماوه هۆشم
كه‌ي من وتم سووتان و بێ خه‌به‌ری
عه‌شقی تۆم ویست   تۆ چی بووی
كه بۆ گه‌یشتنم
مه‌جنوون بووم
چما هیچ نیم .

...

ئه ژنۆم دەشكێنمەوە
تا لای خوا ئه قیژێنم
دەمهەوێ تەواوی که م
ئەم زوڵمە و ئه م ژینه ڕەجم كراوە
بۆگلایه هاتووم ...
بۆ گرتنی جوابێ بۆپرسیارەكه م
بۆچی ئەبێ وابێ
بریندار بم
برینەكانم زات نەكه ن بقیژێنن
بۆ ئەبێ له ترسی حەیای ژنانەم
كفنی خامۆشی له بەر كەم
پەردەی ئاوینەكان لا ئەبەم
گڕی عەشق هەموو لەشمی زامار كردووە و
هەر زامی باسی به یەک نەگەیشتنی
من و هەستی من و ئەوینی منه .



# ئەمین گەردیگلانی

**شاعیر و چیرۆکنووس و وەرگێڕ ؛ ساڵی ١٣٤٩لە گەردیگلانی سەر بە شاری بۆکان لە دایک بووە.**

**ئەم بەرهەمانەی بەچاپ گەیشتوون :**

| | |
|---|---|
| **تاپۆی وەرزێکی سەوز** | **کۆمەڵە شێعر** |
| **شەوەژانی ئەستێرەیەک** | **کۆمەڵە شێعر** |
| **مەرگە خەون** | **کۆمەڵە شێعر** |
| **تەپڵی ئاور** | **کۆمەڵە چیرۆکی بیانی** |
| **دیسان لەو شەقامانەوە** | **کۆمەڵە چیرۆکی بیژەن نەجدی** |
| **جێگای بەتاڵی سلووچ** | **ڕۆمان مەحموود دەوڵەت ئابادی** |
| **خۆر و لاو لاو** | **کۆمەڵە چیرۆکی مناڵان** |

**ئامادەی چاپ :**

| | |
|---|---|
| **برایانی کارامازۆف** | **ڕۆمانی داستایۆفسکی دووبەرگ** |
| **خولیای نووسین** | **کۆمەڵە وتار ی ڕەزا بەراهەنی** |
| **یەک گرتن** | **کۆمەڵە چیرۆکی مناڵان** |

# باوەشی باران

خەم دلی خستوومە جەغزی ئاگری ژانێکەوە
هەر شەوەی دەخزێمە ڕۆحی سەوزی گریانێکەوە
بۆیە شەو ئەشکم دەبێتە گوڵ وشەی شێعری ئەوین
ڕۆژ نیگام دەدرووم بەتیشکی نیو نیگای جوانێکەوە



گوندی ژینم بۆتە جاڕی خوێن و فرمێسک و برین
بۆنی مەرگەو دێ لە نێو هەرماڵ و کۆڵانێکەوە
ڕۆژ فەلای بیرم لە مەزرای دڵ دەچێنێ تۆوی ژین
هەرکە شەو دێ وێڵە بەدوای ڕەنگ و بۆی نانێکەوە
پێ لە هەر جێگایە دانێم تێغ و پشکۆ و ئاگرە
بۆ پشوودان بچمە ژێر کەپری چ ئاسمانێکەوە
ئەو مەلانەی ساڵەهایە لەم هەرێمە کۆچ ئەکەن
ئاخۆ چوونە نێو ڕکەی قینی چ یەزدانێکەوە
زایەڵەی هاواری شێعری دڵ بەژانی ئەم شەوم
چۆتە شمشاڵی دڵی خنکاوی چ شوانێکەوە



دڵ ڕەگی تینووی درەختی ژینە بۆیە من
سەر دەنێمە باوەشی گشت قەترە بارانێکەوە

## تاسه

له هەناوی کەسەرا گووراون
بیر و ئیلهام و خەیاڵ هەستم
وشەکان ڕۆندکی دڵمن دەتکێن
له چەمی هەوری ڕەشی هەڵبەستم
***
گوڵ وشه ناسکه لێو پڕ بزەکان
ئێسته ژاکاوه نیگایان دەگرین
دیل کراون له گەرووی تەنگم دا
شێعری دڵ پڕ خەم و چاو پڕ ئەسرین
***
سێبەری خەم له خەیاڵم هالا
نەو چرۆی باغی ئەوینم ژاکان
زامی پڕژانی دڵم وەک خمخۆرک
قووتی دا ئەشق و حەز وهیواکان
***
بەشەوا هەست و خەیاڵ و بیرم
له گەڵ هەر خورپەیەکی دڵ دەگرین
له سروشتی ڕۆحی سەوزی شێعرا
من و ئەشقم شەوی سەد جار دەمرین
***
له شەوی نووتەکی تەنیایی دا
به گرین نۆتی هەناسەم دەشکێ
به شێعر گەرچی هەتا ڕۆژ دەگریم
بێ ئەوین کوا دەمێ تاسەم دەشکێ



## خەدیجە جاوید

**لە ساڵی ١٣٥١ لە سەردەشت لە دایک بووە ، لە ساڵی ١٣٧٩ ەوە لە بوارەکانی شێعر ، چیرۆک ،پەخشان و ووتار دا کاری کردووە، لە گۆڤارەکانی ناوخۆ و دەرەوە بابەتی بڵاو کردۆتەوە هەروەها بەشداری فستیڤاڵەکانی چیرۆکی بانە و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی سەردەشت وپیرانشاری کردوە .**



## بادەگێڕی دۆزەخی

**بادەگێڕی دۆزەخی خوداوەند**

**لە زێڕی باڵا شەکەتی**

**شلێرەوە**

**مەخمەرانە**

**بەری ڕەزی نهێنیەکان ڕائەمووسی و ...**

لە هەناوی تاوانەوە
کۆڵانی یاریم گڕ ئەدا!..
قەدەرم ڕنی ؛ پڕی دەسماڵی چری چۆپی
هێشوە ترێیەک
کە لەمێژوەڵانی چاوەکانی تۆ ...
مەستی باوەشێ بۆ کردبۆوە و
ڕەهێڵەی سووری سەبووری
خەرمانەی نزامی بەربائەدا
خەرمانەم بەربائەبێ ؟!
مناڵانەلە گلارەی ؛ خەونەکانم گل ئەبمەوە !؟!
یا لە ترپە شێتەکانی دڵی سەبر
سڵاو ئەکەم ؟؟
...ئێستا لێرە ..
ئیتر نەمن خوا ئەناسمەوە
نە پەنجە ڕیشۆڵاویەکانیبادەگێڕ
من لە باقژی مێیینەی هەنار
جیائەکاتەوب !!
من قۆپیەی شەهادەی شەرم
دەئاڵێنمە باڵام ..
نە ئەویش دۆزەخەکان ..
چەند کۆڵان ...
چەند گەرەکێکلاچەپەک تر
بەنامۆیی من ئەسپێری ..



## شوعلە بێگزادە

**شاعیری لاوی بازێری سەقز**

# ئێوارەی مارس



**شار چەبکە گوڵێکە قۆڵبەستە**
**ڕاکشاوە لە سەر مەزاری ئێوارە**
**زۆر بێدەنگ و**
**تا دەقی هەڵبەست هەڵ ئەگرێ پڕ پەژارە**
**ڕایەڵەی بیر دەنگێک تەنی**
**خانم فەرموو!**
**ئاغا بۆ کوێ ؟**
**بۆ باوەشی مەیلە و سووری لالەی سەرخۆش**
**بۆ نێو وڵاتی ئاوارەی بۆی گوڵ باخی**
**سەفەر کەینە دووتۆی حەیران**
**بینە خاوکەرێ سەربزێو وێڵی شاران**
**سوار هەناسەی ئاوات ئەکەم**
**مانگ دەکەمە ملوانکە بۆت**
**بڕیار ئەدەم**

که هەتاویش سەردانەوێن ڕۆژ ژمێری باخەڵت بێ
ڕەنجە کانت بسووتێنێ و بەردەوام شادیت بژمێرێ
من پێم وایە
هەموو مێرگ و چیمەنەکان دەبێ کۆچ کەنە گلێنەت
دەستی خەزانیان پێ نەگا
خاتوونی با بوو وڵاتی وەراندیان نە با
خانم وەرە سوار باڵی شەتاو بین
غا مژ لە خاکە لێوەی بەهار
گاون وێڵی دەریاببین
ئاغا بڕۆ
ئەم شوستەیە شاهیدمە
شۆڕب بێک هات و وتی :
کراسێکی مەیلە و زەردی
لە هەتاوی تێکەڵ دەریای بۆم بڕیوە
ئەم دارتیلە لە بیریەتی و ئاگای لێیە
شمشاڵێکی شاعیر هات و بڕیاری دا
بمباتە خەزانەی شیعر و
ئاوازەکان بە پرچی من دابەش بکا
هەموو تەماشای بە جێماوی ڕێبواران
هەنیک و حەسرەت و ماچی داکەوتوو لێیان
ئاگاداران
باڵندەیەکی پزیشک هات و پەمانی بەست
زامەکانی منی دەرد ئاژن تیمار بکا

ئاخ و خەفەت و ویلانیم پەرتەوازە و
پێکەنینم تۆمار بکا
ئاغە بڕۆ   هەموو ئەوان هەر وەک تۆ وان
ڕێگەی بیریان بەفر شێوە کە توایەوە
هەڵبەستی تفەنگی یاخی و شەهید بوونی خاسەکەویش بڕایەوە
وێنە هەنگاوی ڕێبواریٚ
با عاشق بیٚ با شاعیر بیٚ
ناکەوێتە یانەی بیریان
کوا هەڵ ئەگریٚ
لە ڕیٚ ڕەوی ڕەنگ پەڕیوی تاریکی تۆ
شاعیرێکی بیر ڕەنگینی سەر گەواڵەی سەربەستی پیاسەبکات ١٠٤
زامەکانم مەهێنە سۆ
ئاغە بڕۆ ...
وا گیانی من قاقرێکە ئاگر گرتوو
کەی پیٚ دەچیٚ تۆ بزانی ناو نیشانی هەور و باران
کوا دەزانیٚ چۆن دەسووتیٚ ئێسک و پرووسک
دڵ چۆن ئەمریٚ
کەی ئاشنای بەوڵاتی ئاگر باران
کەی گۆڕی بەکۆمەڵی پەپوولە
قەت نەیدیوە خەفەتی ئاگردان
کاتی فرمێسک ڕژان
هاوار ئەکاو ئەناڵێنیٚ:
بە من ناکریٚ سووتانی دارستان

چەن دیمەنی گۆڤەنی ئەستێران
چەن ژوانی ماچی مانگ و ماسی
لە کاتی نوستنی چەما
چەن بەهاری زەرد و ڕەنگ پەڕیوی پەت لەگەردن
ئاخۆ قەت پاییزی سەوزت دیوە
ڕیسوائەبم چۆنت دوێنم
چۆن لەم مەرگەساتەت گەیێنم
ئاغە بڕۆ ئاغە بڕۆ
هەمووی ئەوان کەهاتن و چوون
هەر وەک تۆ وان
جێ ناگرێ یادگارێ
لە ئەلبۆمی مردووی مێشکیان
دەتۆیش بڕۆ و دڵنیا بە
بەشی ئاواتی فڕینم تاکەی
ئەوین لای من شاری خۆرە
قۆڵبەست ناکرێ و نایێتەخوار
تۆ ۆێیی ناگەی
کوا زانیتان ... کوا زانیتان ؟
ئێوە و ئەوان
ڕەستەیەکم خەڵات بکەن
لەو ڕۆژەی واناویان نابوو
ڕۆژی ژنان



# شلێر ڕەشیدی

شاعیر وئەندامی بڵاڤۆی ڕاسان



## چیتان ئەوێ

مەرگی هەناسەمت دیوە
ئەو سێدارەی ڕۆژی سەدجار
بۆ گوناهی قەت نەکردووم هەڵخرا ؟
دیوتە ژیانی پڕ لەگڕ
هەزر و بیر تیا هەڵ ئەقرچا ؟
ماڵ بەستەیی من ئەبینی
وەک دیلێ بەکە لەبچەوە ؟
ڕەشاوی شەرەفت ئەدی
بۆم ئەبارا ؟
ژیانم گەردە لوولێک بوو

ڕێبوار تێی دا سەرلێ شێواو
بیرەوەریم بوو بەتاڵی و
خەڵوز خانەی یادەکان
چیتان ئەوێ ؟
من بەکەس قۆڵبەست ناکرێم
من شێتی زنجیر پسێنم
داب و نەریت لێم ڕائەکەن
شەپۆلی هەڵچووی مەراقم
پیاوەتی بۆ کەنار ئەبەن
هەناسەی بن لە سەر کۆتەیەکی
بێ ڕۆح دیسان ڕێگاژۆی کردوە
پەتی سێدارەم چڕیوە
تاوانم ئاور تێ بەردا
داسی ئێوە پۆلای مێشکم نابڕێ
ئاگری ڕق ڕۆباری ژین ناسووتێنێ
کێ ئەتوانێ ڕاوم بکا
کێ ئەتوانێ تەواری سەر ئەو دوندانە
ماڵی بکا
چەن مێڵەم نە چەماندووە
چەن قەفەسم نەشکاندووە
بوومەتە خوێنی دەماری جەستەی وڵات
من وڵاتم هیچ دژمنێ پێم ناوێرێ.

# نەفرەت

دەست بۆ هەتاو ئبکێشم
بەری حەز و بەری ئۆخەی
بچنمەوە
دەست بۆ هەتاو ئەکێشم
کەچی لەت لەت
مێشکی گەنیو دێتە دەستم
چۆڕ چۆڕ نەفرەت و ڕق
بەهەناسەما دێتە خوارێ
دەست بۆ خوا ئەکێشم
کەچی چەن سێدارە
لە گەل لاشەی پەڕەسێلکەی
بێ تاوان دێنە پێشم
دەست بۆ هەتاو ئەکێشم
کەچی سێلاوی حەسرەتێکی
شەرمەسار ڕۆحم دەبا
سڕم ئەکا
دەست بۆ پەیکەری شێعر ڕا ئەکێشم
کەچی کەڵبەی دەسەلات
ماناکانی هەڵ ئەدڕێ
چنگم ئەبەم

چی بەرۆکی حەزەکانە
دای بدڕم
کەچی حەسرەتی ملوانکە
فرمێسکاویم ئەکات و هانم ئەدا
کە دووبارب بەرەو ئاسۆ
دەس ڕاکێشم

...

لە خەڵوەتی ئەمشەوم دا
کە شەو پانی کرد تیشکی مانگ
من و دڵێکی شێت و شەمێکی نیوەگیان ١٠٩
لێرە تەنیاین
شەم لە ئاویلکە دا و
دڵی بێکەس ژانی خەمێکی نوێ گرتوویەتی
ئەم هاوارە باڵا بەرزە
بۆ لە دایک بوونێکەیا دابڕانێ بێ کۆتایی بە کۆڵەوە
ئەستێرەیێک پڕ بە جامێ خۆشەویستی ئەداتە دەستم
ئەڵێ ئەمشەو تەنیا پێکێک میوانم بە
ئای دڵگیرەدووری لە ژان و خەم و ئازار
لەگەڵ مەستی و ئاوازی خۆش
ئەستێرەیەک بگرێتە کۆش

# تاسە

بۆچی نایەی ؟
تریفەی مانگ
تیشکی هەتاو وئاوی ڕووبار
ڕەش هەڵگەڕان
بۆچی نایەی ؟
دار سێوەکان
گۆنای سووری گوڵی ڕەز و
ڕوخساری عاشق زەرد هەڵگەڕان
بۆچی نایەی ؟
خەمی دووریت پشتی شەقام دەچەمێنێ
جێ ژوان گریانە
هەوێنی زەردەخەنەێ
جووتە کۆتری ئەم نیگایە کە نەهاتی
دنیا گەڕان
ئەم شیعرستانەش سەوزەی
خەوی ڕێبوارێکن
هەموو بەیانێک زەرد
قەڵا ڕووخانە لەم ڕۆحەو
مەرگ تارای ئەوینێکە

کەچی زاوا هەر مەست
هۆ شۆڕە سوارە مەستەکە
کە نەهاتی !
گۆڕەپانی جلیت بازیت
دەرکەی پیلۆوی لەسەر داخرا
مەرۆ کەسم
کە ڕۆیشتی
تەدارەکی چڵە نێرگس
نە چەپکێ جارە داخی بۆ
ماڵئاوا و پرسە بوو
پەرداخێکی تاڵ لە ون بوون ١١١
شێتم ئەکا و بەنووسینیش
ناتناسمەوە
بلێم تۆ چی و منیش هەر مانگ
تۆ ڕۆیشتی سەری شێتم
نایە سەرینی ئەم توولە ڕێ یە
ئاڵۆزە خەو خۆی و تەعبیری
وائەڵێن
حەسرەت پۆلائینەو
قوفڵی دەرگای تابووتی کەل.

...

تاوان بارێکی بە مە لۆتکەی تاوان کردوو
لە دایک بووێکی بە بێ خەندە و بێ گوێزەبان
گەورە کچێکی کەی بانووی بێ بەش لە ژوان
کچەتازە پێ گەیشتویەکی مەحکووم بە ژێر دەستەیی
هاوسەرێکی چاو ترسێن کراوی
دەس و لاق شکاو
نامرۆڤ
نۆکەرێکی بێ مووچە و بەرەی بێ زمان ١١٢
دڵدارێکی بە شۆخی گیراوی فریودراوی
پێموابێ سووکیش
ئاخر کاتی خۆی بەدڵدارەکەی  وتبوو
خۆشم ئەوێی
شۆڕە ژنێکی تەنیا لە نێو شێعردامروڤ
حەبسێکی تادوا هەناسە زنجیری ژێر دەستەیی
بە بێ بیر وو بە بێ ئاسۆ
پیرێژنێکی عەقڵ ناقسی شێت
دەروێشێکی تۆمەت بار بەبێ ناموسی
عەبدێکی ڕووسیا
جەهەنمێکی بە بێ تۆبە لێ وەرگرتن
ئەچێتە بارەگای خوا:

دە پێم بڵێن تاوانباری کام گوناهم
دە پێم بڵێن تاوانباری چیم
ئەم زنجیرەم لێ تووڕ بدەن
ئەم کۆت و بەندەم بشکێنن
ئاخ بۆ هەناسەیەک بۆ ئازادی

# سروە حوسێنی

**لە دایک بووی ساڵی ١٣٦٤ خوێندکار دەروونناسی زانکۆی سەقز**

## بیرت ناکە م

نە سووتا مۆمی ئاواتت
لە گە ڵ پەپوولەی ئاوا تم
گە زی نەکرد ڕێگای جێژوان پێڵاوی حەزی نامۆت لەگەڵ هەنگاوی کچانە م
دە ستی لە مل خەمم نەکرد سۆزی حەیرانی کوڕانەت
نەی سڕی ئەسرینی گەرمم دە ستی دووڕو ڕقاوی تۆ ١١٤
نەتووت دڵنیا بە شا جوانی گڵ لەگەڕانەوم دلنیا بە بیرت ناکەم
پڕ پڕ بە باوەشی ڕۆشتنت لێت دوور دەبمەوە ئاوڕم لێ مەدەوە
بیرت ناکەم
وەکو چڵکنی ڕووی درۆ لە من و سۆز یاری ژینم دوور بەوە
بڕۆ... خێرا... هەنگاو بەرە و پێشتر بنێ
مەگەڕێوە من لە مێژە ئاوی ماڵاوییم بە دووی ڕەوانە کردنی هەستی درۆت ڕژاندووە
من هێلانەی پەڕە سێلکەم لە تۆ نا وێ کە بەهاران بیکە ی بە کۆشکی شابانو وزستانانیش ...
لە سەخڵەتی سەرمای خەمدا بە جێ بێڵی.

## بیرت ده كه م

به قه‌د باڵای چاوه‌ڕوانی
به قه‌د زه‌جری دوا هه‌ناسه
وه‌كوو شه‌رمی كوڕه‌ خاسه
به قه‌د بڵیندایی ئاسمان
به قه‌د ئه‌شق و نازی چاومان
ب...ی...ر...ت...د...ه... ك...ه...م
ئێجگار زوو زوو
به‌ڕه‌شایی پرچی شه و گار
چاوه‌ ڕێتم وه‌كوو به‌هار



## پوو ڵه وردە

پووڵه‌ ووردەكا نی هه‌ستت كه‌ له‌ جه‌ژنانه‌ی چاوه‌كانما پێم داوی
به‌ختی مه‌كه‌ بۆ هه‌ ڕشتێ
بیسپێره‌ به‌ ده‌خڵه‌ قووڵه‌كه‌ی دڵم
تا كوو له‌ ڕۆژی پێویستت به‌ دووسه‌د به‌هره‌ی وه‌ فاوه‌ بیگریته‌وه

...

Fێکی بیست و چەند ساڵە ئەگەر هەیە pm بدات
من قسەی درۆ و
خەیاڵی کەژاڵێکم پێیە
Fێک نەبوو ووووو ؟؟؟؟؟؟
من بێزوو بە کەنیشک و کانی ئەکەم
( کەنیشک یانێ قەدەخە تەنانەت لە ماچێکیش )
من لە وڵاتی بەفرەوە ئەدووم
خۆرەتاو سەبری لێ بڕیوم
من لە وڵاتی بەرزی ئەسپەوە ئەدووم
ئێوە لە ئەسپ تێ ناگەیەن
سەوزە
خولیام بە خەیاڵت ئەسپێرم
کە تۆ سەوزەی
کۆڵان تەسکە بۆ تۆ
هەروا کە نەفەس بۆ من تەنگ
( ماچ یانی ئۆکسیژن )
ئاسمیم سەوزە من
ئاسمیم
نەیتە دەرێ
هەروا کب – فەشن – باڵات جێی نابێتەوە

ئەم پۆلیسانە سەوزن
سەوز ئەتبینن
سەوزە خوەریت ئەکەن
من ژنێک ئەناسم لە تفەنگا ئەتەقێتەوە
هەروا کەتۆ لە ماتیکا
من لە ئوکسیژنی تاڵی لێوەکانتا
چ بوو وووووو
بۆچ ڕۆیشتی
ئەک لەعنەت لب فیلتێر
تازە لە سبر سپیایی سینگتا ئەسپی بووم
( ئەسپ لە فیلتێر تێ ناگەیێ )
تازە لە سەر سینگت بەفر ئەبارێ
من لە تۆدا ناتوێمەوە
هەروا کە کوێستان لە بەفرا
لەعنەت لە سووراو
لە ماتیک
لە نیۆتۆنیش
کە جازبە لە هەنارا نادۆزێتەوە
منیش Dcووم
( داوەشێ شاعیر ئەگەر proxyسایتی ئەوینی پێ نەبێ)
منیش DC بووم
هەروا کە کەنیشک
لە قە با ئەمرێ



# ناسر یەزدانی

بەرپرسی ئەنجومەنی ئەدەبی فەرهەنگی دیواندەرە لە ۵۵/۷/۱ لە دایک بووە لە ساڵی ۱۳۷۱ وە خەریکی شێعر نووسینە لە ساڵی۷۶وە بەرهەم لە بڵاڤۆکانا بڵاو ئەکاتەوە کتێبی نەختێ ئێوارەی ئامادەی چاپە.



## ئێوارانە

مردن لە پیاڵەیەکی چا
پڕ ڕەنگترە لە تاڵ
بیرێکی
تاڵ...تاڵ
تاڵ...تاڵ
شیم زمکاتەوە

❊❊

بڵاو ئەبمەوە بە عەشقێک
ئەچیتە یەک لە ڕقێکا
کەسک کەسک

ئەمرم
ڕەش ڕەش
ئەژی
❊ ❊
ئەم قانگەشم
بۆ تۆ سووتاند
لە پارەکەی خۆتەوە
تا ئەم ڕۆی من
سێ ساڵ زیاتر
باڵات کردووە
- نەکەویتە بەر نەزەر-
لە پارەکەی خۆمەوە
تا ئەمڕۆی تۆ
سێ ساڵ زیاتر
تەنیا ترم
-من کەوتوومەتە بەر نەزەر-



## سمایل عەزەمی

شاعیری شاری دیواندەرە لە ١٣٥٢/١٢/١ لە دایک بووە لە سالی ٧٠وە خەریکی شێعر نووسینە لە سالی٧٦وە بەرهەم لە بلاڤۆ کوردییەکانا بڵاو ئەکاتەوە کتێبی فەرهەنگی تازەی هەورەکان و کەشتییێک تەنیایم ئەباتە سەر شەقام ی ئامادەی چاپە.



نیشتمان حەز ئەکەی
کام شێعرەم بۆ تۆ بێ
بێدەنگی
جریوە
یان گریان
یان کاتێ ئەت بینم
لە جەستەی ئینسانێک
کە داری دڵداری ئەنێژێ
ئینسانێک

# کەسانێک بەشەقامێک دا تێدەپەڕن

وەک تۆ کەسانێک زۆرن
کە لە مەودای بەهار ئەدوێن- پێدەکەنن
چەکەرەی پەپوولەن
کەسانێک بە شەقامێک دا تێدەپەڕن
خولیان
کە ئەدوێن ڕێبوارن
❊
با ... بەهاریش
هەر حبکایەت لە وەرز ئەکەن ...
ئێوارە هەر ئێوارەیە و
ڕۆژ کەناری بێ خەبەری گرتن
شەو خولیا بژاردن
❊
وەک تۆ کەسانێک کەم نین کە پەپوولەن و کاڵ
هەر ئەڕوانن
❊
سەفەرێک هەر چەن تا بەهار
خولیای منیشە
لە سەرەتای پاییزی هەر ساڵ دا
ئەم خولیا ئەبێتە ئاوات
ئەمخاتەوە بەهار ...
هەر مەمنوونم
❊

کەسانێک بەشەقامێک دا تێدەپەڕن
نە شەقام دیارە
نە کەسیش ئەیانبینێ
کەسانێک لە شەقامێک دان دەوریان نیە
وەک دوورگەیەک
لە هەوادا سەرگەردانن
بە سەر عومری پەپوولە دا هەنگاو ئەنن
بە شەقام دا تێدەپەڕن

...

سمۆرە کچێکی کێوی بوو
بەتەنیا هەر لە سەر لق و پۆی دار گوێزا
کورێکی خۆش ئەویست
شەوێکی مێژوویی
بۆ سەودای ماچێکی زەوینی هاتە خوار
دەست نەکەوت
ئیتر سای دار گوێزی جێ هێشت و
هاتە شار

...

ئارامم / وەک هەنگی سەر گوڵی نەو بەهار
بێ دەنگم / وەک شەوی سەر مێزی ئینتیزار
سەر خۆشم / وەک کچێ تەونێکی دڵداری هەڵ ئەخا لە سەر دار